



نــــاوی کتێب: کۆمەڵگەی ئاشتی و خۆشەویستی

نووسینـــــی: ئیدریس عەبدوڵڵا

نەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین

نورەو ساڵی چــاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٢٠.

ژمارەی سپــاردن: (٢٥٨٤)ی ساڵی (٢٠١٩) ی پێدراوە.


............................................................


دەزگای چاپ و پەخشی نارین

هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

Website: www.nareenpub.com

E-mail: nareenpub@gmail.com

تەلەفۆن:٦٦٢٥١١٩٨٢ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل:٠٠٩٦٤٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# کۆمەڵگەی

# ئاشتی و خۆشەویستی

کۆ بەسەرهاتێکی واقیعی و کۆمەڵایەتی موسڵمانانە


**نووسینی**

ئیدریس عەبدوڵڵا





دەزگای چاپ و پەخشی

نارین



# پێشەکی

سوپاس بۆ خوای میهرەبان.. درودو سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ئاشتی و خۆشەویستی.. سڵاوی خوا لە خوێنەرانی ئازیز و خۆشەویستم.. ئەم کتێبە کۆباس و بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەی نێو کۆمەڵگەی ئیسلامییە، ژیار و شارستانیەتی موسڵمانان و گەورەیی دین و پێغەمبەرەکەی پیشان دەدەن (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، دەری دەخەن کە بەها ژیاری و حەزارییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەندە ئینسان بەرزدەکەنەوەو چۆن دەیبەنە پایەی بەرزی مرۆیی، دیسانەوە ئەوەش دەردەخات، کە: ئەگەر بێت و بە قورئان و فەرمودەو ژیاننامەی صەحابەکان (ڕەزای خوایان لەسەر) پەروەردە بین، ئەو پەروەردەیە و مەفاهیمەکانی ئەو دینە جوانەش لە سلوك و کردەوەکانمان ڕەنگبداتەوە، ئەوسا چەندە جوان و شیرین و گەورە دەبین.

ئەم کتێبە ڕۆژانی خۆش و پڕ ئارامی دەروونی و شادی کۆمەڵایەتی دەگێڕێتەوە، بەو هیوایەی هەموومان لە ئاستی گەورەیی بەها حەزاری و ژیارییەکانی دینەکەی خۆمان بین و جوانترین نمونەی خواناسی و ئینساندۆستی پیشانی هەموو دونیا بدەین.

خودای میهرەبان هەموو لایەکمان شاد و ئاسوودەو بەختەوەر بکات. ئامین

براتان: ئیدریس عەبدوڵڵا

هەینی ٢٠١٩/١١/٢٩







## موسڵمانان لە خزمەتی یەکترین

ئیمامی حەسەن (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگوت: ئەگەر بێت و ئیشی براییێکم جێبەجێ بکەم، لەلام خۆشترە لەوەی ساڵێك ئیعتیکاف بکەم!!

مەبەستی ئەوە بوو: ئاینی ئیسلام ئاینی کار و کۆششە، ئاینی خزمەتگەیاندنە بە هەموان، موسڵمان دەبێ لەو ئاستە بێ، کە ئاینەکەی داوای لێدەکات، چونکە هەموو ئیعتیکاف و خواپەرستییەکە، هەموو خواناسی و دینداریەکە، بەشێکی بۆ ئەوەیە: لە دونیادا موسڵمانان لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ خەڵکیش بە گشتی باش بن، دەستی خێر و چاکە بن بۆ یەکتری.

## موسڵمانان پەیمان پارێزن

هارونی کوڕی ڕەباب دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کە عەبدوڵڵا کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوا لە خۆی و لە باوکی بێ)، گەیشتە سەرەمەرگ، گوتی: فلانم بۆ بدۆزنەوە؟

گوتیان: لەبەر چی؟

گوتی: من لە بارەی کچێکمەوە قسەییێکم لەگەڵی کردووە، بۆنی ئەوەی لێهاتووە پێی بدەم، جا نامەوێ بە سێیەکی نیفاقەوە







بگەڕێمەوە لای خودام ـ واتە پەیمانشکێنی بکەم ـ، بۆیە ئێوە بە شاهێد بن، کە: من ئەو کچەم دایە ئەو پیاوە!!

## ئەوەی باشترە، ئەو خواناسترە

پیاوێك هاتە لای ئیمامی حەسەن (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێی گوت:

ـ کچێکم هەیە گەورە بووەو خەڵك داوای دەکەن، بیدەمە کێ؟

ئیمامی حەسەن پێی گوت:

ـ بیدە ئەو کەسەی لە خوا دەترسێ، چونکە ئەگەر خۆشیویست، ڕێزی لێ دەگرێ و ئەگەریش لێی تووڕە بوو، ستەمی لێ ناکات!!

## موسڵمانان پشت بە خوا دەبەستن

عەبدوڵڵای کوڕی خیار وەکو لە مەجلیسان دادەنیشت، دوعای دەکرد و دەیگوت:

خوایە گیان سەلامەتمان بکەو ئیماندارانیش لە زمانی ئێمە سەلامەت کە.



## موسڵمانان شت بە ڕووەکەی تر دەبینن

پیاوەك هاتە لای فوزەیلی کوڕی عیاز، پێی گوت: ئەی ئیمام.. فلانە کەس بە بەردەوامی غەیبەتی من دەکات؟! من چی لێبکەم؟!

فوزەیل وەڵامیدایەوە، پێی گوت: ئەو فەقیرە خێرەکانی خۆی هەموو بۆ تۆ دەنێرێ، ئیدی تۆ بە تەمای چی لێ بکەی؟!

(عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی)ش قەت توڕە نەدەبوو لەو کەسەی غەیبەتی دەکات، بە پێچەوانەوە بەزەیی پێدا دەهاتەوە، دەیگوت: ئەگەر گوناە نەبووایە، حەزم دەکرد خەڵکی سەر زەوی هەموویان غەیبەتی من بکەن، چونکە بەو غەیبەتانەیان من هیچم لێ نایێ، خێری ئەوانیش بەبێ ئەوەی من ئاگام لێبێ، دێتە نێو کتابی کردەوەکانی من بۆ ڕۆژی دوامایی، دەی چ شتێك لەوە خۆشترە وەکو کتێبی کردەوەکانت لە ڕۆژی دواماییدا وەرگرتەوە، ببینی پڕاوپڕی خێرانێکە، کە خۆت ئەنجامت نەدابن و ئاگات لێیان نەبێ؟!

(تەوقی کوڕی مونەبیە)یش دەڵێ: محەمەدی کوڕی سیرین هاتە لام، بینی وەزعم باش نییە، لێی پرسیم: هەست دەکەم بە دەست شتێکەوە دەناڵێنی؟!

وەڵامـمدایەوە، گوتم: بەڵێ، کەمێك نەخۆشم..









گوتی: دەی باشە برۆ لای فلانە دکتۆری و دەرمـانێکی لێـوەرگرە، لە پاشان گوتی: ناوەڵڵا برۆ لای فیسارە دکتۆری، ئەویان باشترە..

دوای ئەوە گوتی: ئەستەغفیرەڵڵا، وا هەست دەکەم ئەوەی یەکـەم غەیبەت کرد!!

## موسڵمان نابێ بە پێش خوا بکەوێ

دەڵێن: یەك لە خواناسـە گـەورەکانیان لـە خـەودا بینیـوە، لێیـان پرسیە: حاڵت چۆنە؟!

وەڵامیداوەتەوە: من بە هۆی قسەیەکەوە، کە کاتی خۆی کردومـە، گیراوم و حاڵم پەرۆشە؟!

گوتویانە: ئەو قسەیە چییە؟!

گوتوویەتی: ساڵێکیان باران دواکەوتووە، منیش گوتومە: وای ئـەم خەڵکە چەندە پێویستی بە باران هەیە؟!

بەڵام خوای گـەورە بـەم قسـەیەم ڕازی نـەبووەو فەرموویـەتی: تۆ چوزانی؟! من بەرژەوەندی بەندەکانم باشتر دەزانم!!







## موسڵمانان مافی هاوسێ بە گەورە دەزانن

موسـڵمانان گوتیـان: تـۆ بەوەنـدە نابییـە هاوسـێیەکی بـاش بـۆ هاوسێکەت، ئەگەر بێت و زیانت بۆی نەبێ.

بەڵکو بەوە دەبیە هاوسـێی بـاش بـۆ هاوسـێیەکەت، ئەگـەر لـە بەرامبەر خراپییەکانی ئـەو، تـۆ بەرگـە بگریـت و هـەر بـە باشـی بمێنیتەوە.

## موسڵمانان دەبێ ڕاستگۆ بن

عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوایان لێبێ)، کە بە (ئیبن و عومەر) بەناوبانگە، لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێکانی بەرەو دەرەوەی شار دەچوون، لە ڕێگە چاویان بـە شـوانێك کـەوت، ئـیبن و عومەر بە شوانەی گوت: مەڕێکمان لەو مەڕانە پێ بفرۆشە.

شوانە گوتی: ئاخەر من خاوەنی ئەو مەڕانە نیم، ئەو مەڕانـە هـی پیاوێکن من کۆیلەی ئەوم.

(ئـیبن و عومـەر) پێـی گـوت: ئـێ تـۆ بـە ئێمـەی بفرۆشـەو بـە خاوەنەکەشی بڵێ: گورگ خواردی.

شوانە گوتی: باشە ئەوەم بە خاوەنی مەڕەکە گوت و بـەو قسـەیەم ڕازیکرد؟ بەڵام ئەدی چۆن خودا ڕازی بکەم؟!









(ئیبن و عومەر) بەمە دەستی کردە گریان و لەبەرخۆی هەر
دەیگوت و دەیگوتەوە: ئەدی خودا ؟! ئەدی خودا ؟!

بۆیە ئەو شوانەی زۆر خۆشویست و چووە لای خاوەنی ئەو شوانە، شوانەی لێکڕی و لە پێناوی خودا ئازادی کرد، مەڕەکانیشی کڕی و هەمووی دایە ئەو شوانە!

## نابێ جوێن بە گیانداریش بدەی

تاجەدینی سوبکی کوڕی تەقییەدینی سوبکی، خۆی و باوکی، هەردووکیان لە زانایانی شافیعینە، دەڵێت: لە حوجرە دانیشتبووم، سەگێك خۆی کرد بە ژووردا، منیش توڕەبووم، پێم گوت:

سەگی کوڕی سەگ بڕۆ دەرەوە.

باوکم گوتی: کوڕم وسبە، وازبێنەو قسەی وەها مەکە.

گوتم: بۆچی بابە گیان؟! بۆ ئەدی سەگ نییە؟!یانی قسەکەم ڕاست نییە؟!

باوکم گوتی: قسەکەت ڕاستە کوڕەکەم، بەڵام تۆ وەکو هەقیقەت ئەو قسەیەت نەکرد، وەکو جوێن و سوکایەتی بە سەگەکە ئەو قسەیەت پێگوت، ئەوەش لە دینی ئیسلام حەرامەو خودای گەورە قەبوڵی ناکا.







## موسلمانان خاکین!

ڕۆژێکیان هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودو سلاوی خوای لەسەر) لە مەجلیسێکدا پێکەوە دانیشتبوون، پێغەمبەریان لەگەڵ نەبوو (درودو سلاوی خوای لەسەر)، ئەو هاوەڵە بەڕێزانە چەندانێکی زۆر دیاریان لە نێودا دەبینرا، ئەوانە بریتی بوون لە: ئەبو زەڕی غەفاری.. عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف.. خالیدی کوڕی وەلید.. بیلالی حەبەشی (ڕەزای خوایان لەسەر).. هەموویان لەسەر بابەتێکی گرنگی تایبەت بە موسڵمانانەوە بیروڕایان دەگۆڕیەوە، ئەبوزەڕ لەو دانیشتنەدا زۆر گەرم ببوو و بە حەماسەتێکی زۆرەوە قسەی دەکرد، ڕایەکی دیاریکراوی هەبوو، کە: سوپا وەهاو وەها ئاراستە بکرێ.

بەڵام هاوەڵان لەگەڵی نەبوون، لەگەڵ ئەوەش دیارە حەیایان دەکرد، بە ئاشکرا پێی بڵێن: ڕایەکەتمان بە دڵ نییە، بەڵام دەشبوو هەقیقەتەکەی هەر پێ بگات، بۆیە بە ئەدەبێکی زۆرەوە بیلال پێی گوت: نەخێر برا.. ئەو پێشنیارە هەڵەیە!!

ئەبوزەڕ بەمە زیاتر توڕە بوو و پێی گوت: چییە کوڕی ژنە ڕەشکۆکە!! تەنانەت تۆش هەڵەم لێ دەگری!!

بیلال بەو قسەیە توڕەبوو و بەداخ و سەرسامییەوە مەجلیسەکەی بەجێهێشت، گوتی: وەڵلاهی دەچم ئەو قسەیەت دەگەینمە







پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) و لەلای ئەو شکاتت لێ دەکەم.

ئیتر بەرەو پێغەمبەری خوا ڕۆیشت (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، گەیشتە لای و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا: دەزانی ئەبوزەڕ چی لە بارەی منەوە دەڵێ؟

پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) فەرمووی: چی لە بارەی تۆوە دەڵێ؟!

بیلال گوتی: وەهاو وەهای پێ گوتم!!

بەمە ڕوخساری پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) گۆڕا.. ئا لەو کاتەدا ئەبوزەڕی غەفاڕی کە هەستی بە مەترسی بارەکە کردبوو، بە پەلە خۆی کرد بە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) و سڵاوی کرد، گوتی: ئەلسەلام و عەلەیکوم وەڕەحمەتوڵڵاهی وەبەرەکاتوهو ئەی ڕەسولوڵڵا!!

پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) پێی گوت: ((یا أبا ذر أعیرته بأمه .. إنك امرؤ فیك جاهلیة))!! ئەوە ئەی ئەبوزەڕ!! بە هۆی دایکییەوە ناشیرینت کرد؟! تۆ مرۆڤێکی شتێك لە جاهیلییەتت تیایە!!



ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لەسەر) بەمە گریا؟! هاتە نزیك پێغەمبەری خـوا (درودو سـڵاوی خـوای لەسـەر) دانیشـت و پێـی گـوت: ئـەی ڕەسولوڵڵا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، داوا بکـە خـوای گـەورە لـەو گوناهەم خۆش بیّ!!

دوای ئەوە بە گریانەوە لە مزگەوت دەرچوو!! چوو لەسـەر ڕێگـەدا وەستا، هەتا بـیلال هاتـە دەر، لـە پـێش (بـیلال)دا لەسـەر زەویـدا ڕاکشا، ڕوومەتی خۆی خستە سەر زەوی و پێـی گـوت: ئـەی بـیلال وەرە قاچ بخە سـەر سـەرم، وەڵلاهـی ڕوومـەتم لەسـەر ئـەو زەوییـە هەڵناگرم، هەتاوەکو پێت لەسەر سەرم دانەنێی و لە گوناهەکەم پـاکم نەکەیەوە!! هـەتاوەکو دڵنیـا نـەبی، کـە تـۆ بـەڕێزی و مـن کـەم و بچووکم!!

(بیلال)یش گریاو بۆ ئەبوزەڕ داچەمایەوە، ڕوومـەتی جـوانی مـاچ کرد و گوتی: هەڵسەوە براکەم، بە وەڵڵا من قەت ئـەوە لەگـەڵ تـۆی بەڕێز ناکەم، قاچ بخەمە سەر سەرت؟! شتی وا چۆن دەکەم؟!!

ئیدی ئەبوزەڕی هەڵساندەوە، یەکتریان لە باوەش گـرت و سوپاسـی خوای گـەورەیان کـرد، کـە بـەو ئیسـلامە پـیرۆزەی ئـاینی ژیـان و خۆشەویستی، ڕێزی لێگرتن و وەها ئاسوودەو دڵخۆشی کردن.









## موسڵمانان عاقڵن

ئەعڕابییەك ماوەیێك لە یاساكانی ئیسلامی كۆڵیەوەو ئیمانی هێنا، لێیان پرسی:

چی وای لێكردی ئیمان بێنی!

ئەعڕابیەكە وەڵامیدانەوە:

بۆیە ئیمانم بە محەمەد هێنا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، چونكە فرمانی بە هیچ شتێك نەكردووە عەقڵ بڵێ خۆزگە فرمانی وای نەكردبووا، نەهیشی لە هیچ شتێك نەكردووە، عەقڵ بڵێ خۆزگە فرمانی بەوە كردبووا...

## موسڵمانان گوریسیان لە بنی دونیا ڕانەكێشاوە!

حەجاجی كوڕی یوسفی سەقەفی، لەگەڵ ئەوەی باسیشی دەكرێت، كە والییەكی توندوتیژ بووەو لەسەر شتی كەم، خەڵكی ئازارداوە، بەڵام هەندێ سیفەتی سەیریشی هەبووە، یەك لەو سیفەتانەی ئەوە بووە، قەت بە تەنیا نانی نەخواردووە، ئەگەر كەسیشی لەلا نەبووبێ یەك لە پیاوەكانی خۆی ڕاسپاردووە، تا بچێت كەسێكی بۆ بدۆزێتەوەو بیهێنێت نانی لەگەڵدا بخوات!!





دەگێڕنەوە: جارێکیان وەکو گوترا نانی بۆ دادەنرێت، بەڵام کەسی لەلا میوان نابێت، ئەویش یەك لە پیاوەکانی دەنێرێت، تا بچێ میوانێکی بۆ بێنێ، بۆ ئەوەی پێکەوە نانەکەیان بخۆن.. ئەو پیاوەی حەجاج دەڕوا، کەسی دەست ناکەوێت، دوای ماندووبوونێکی باش لەژێر سێبەری دارێکدا، دەبینێ ئەعرابییەك خەوتووە، ئەو پیاوەی حەجاج ئەو ئەعرابییە لە خەو هەڵدەستێنێت و دەیباتە میوانداری حەجاج.. حەجاج دڵی پێی خۆشدەبێ، کە ئێستا پێکەوە نان دەخۆن و لە برسیەتیەکەی ڕزگاری دەبێ، چونکە ئەو ناتوانێ بە تەنیا نان بخوات.. بۆیە بەخێرهاتنی ئەو ئەعرابییە دەکات و پێی دەڵێت: فەرموو وەرە پێش با پێکەوە نان بخۆین.

ئەعرابییەکە وەڵامی دەداتەوە: زاتێکی لەتۆ باشتر دەعوەتی کردووم، بۆیە من نانی تۆ ناخۆم.

حەجاج سەیری پێ دێ؟! لێی دەپرسێ: کێیە لە من باشتر؟!

ئەعرابییەکە وەڵامی دەداتەوە: من ئەمڕۆکە بەڕۆژووم و دەعوەتی سەر سفرەی خودای گەورەم.

حەجاج دەپرسێ: یانی بەم ڕۆژە زۆر گەرمەوە تۆ بە ڕۆژووی؟!

ئەعرابییەکە وەڵامی دەداتەوە: بەڵێ بۆ ڕۆژێکی لە ئەمڕۆ زۆر گەرمتر بەڕۆژووم.









حەجاج پێی دەڵێ: دە باشە ئەی ئەعرابی باش دەکەی، بەڵام ئەمڕۆ بیشکێنە لەگەڵ من نان بخۆ و بەیانی لە باتی ئەمڕۆ بەڕۆژوو ببەوە.

ئەعرابییەکە پێی دەڵێ: چییە بەڕێز؟! تۆ عیلمی غەیبت هەیە و دەزانی من دەگەمە سبەینێ؟! هەتا داوام لێ بکەی ئەمڕۆ بیشکێنم و بەیانی پێ ببم!!

حەجاج دەبینێ بەڵگەی ئەو ئەعرابییە بەهێزەو کەس عیلمی غەیبی نییە، بۆیە وازی لێدێنێ و زۆری پێ سەرسام دەبێ!!

## هیچ موسڵمانێك لە فرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی گەورەتر نییە

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێ)، خۆیشی و باوکیشی هەر خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بوون (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، ئەمیری دووایین سوپایە، کە پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنی خۆی ئامادەی کرد، کە لەو سوپایەدا ئەبوبەکر و عومەر و گەورە هاوەڵانی تر سەرباز بوون!!

بەڵام پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) نەخۆش کەوت و باری تەندروستی بەرەو خراپی ڕۆشت، لەبەر ئەو هۆیە، ئەو سوپایە بۆ ئەو ئەرکەی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) بۆی









نەخشەکێشابوو، لە کاتی خۆی نـەیتوانی بەڕێبکـەوێ و ئەرکەکـەی دواکەوت، تا پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خـوای لەسـەر) کۆچـی ماڵئاوایی لە هاوەڵان و لە ئوومەتە ئازیزەکەی کرد و هـەمووانی بـە دڵی شکاو و چاوی پڕ فرمێسك جێهێشت!! بەو کۆچە ئومەت هـەژاو کەلێنێکی یەکجار گەورەی تێکەوت، کە ئێستاشی لەگەڵـدا بێـت و هەتا دونیاش مابێ، ئەو کەلێنە هەر پڕ نابێتەوە!!

بەڵام هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێ)، کە قوتابی ڕیـزی پێشـەوەی قوتابخانەی پێغەمبەری خوا بوون (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، لـەو سەرودەرو مامۆسـتا گەورەیـەیان فێربـوون، ئیسـلام ئـاینی ژیانـەو خۆشەویستی، ئاینی کارە، نەك ئاینی تەمبەڵی، بۆیە هەر زوو ئـیش و کارەکانی دانانی جێگرەوەیەکی پێغەمبەری خوایان (درودو سـڵاوی خوای لەسەر)، تەواو کرد و بەیعەتی گوێڕایـەڵی و خزمـەتیان دایـە، ئـەو هاوەڵـە زۆر نزیکـەی پێغەمبـەری خـوا (درودو سـڵاوی خـوای لەسەر)، کە پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە ژیـانی خۆیداو لە کاتی نەخۆشیەکەی سـەرەمەرگی، ڕازی نـەبوو، کەسـێك شوێنەکەی بگرێتەوەو ئیمامەتی نوێـژەکان بـۆ موسـڵمانان بکـات، ئەبوبەکری صدیقی زۆر خۆشەویست و هاوەڵی ئەشـکەوت و ڕێگـەی دووروودرێژی بانگەواز و خواپەرسـتی و هیجرەتـی بـەرە و مەدینـەی نەبیْ!!



بەڵێ موسڵمانان لەسەر ئەو هەڵبژاردنەی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) بۆ ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێ)، ئەبوبەکریان وەکو خەلیفەی پێغەمبەرەکەیان هەڵبژارد و بەیعەتی درێژەپێدان بە هەمان ڕێگەی پێغەمبەری خۆشەویستیان پێدا.

(ئەبوبەکری صدیق) جڵەوی کاروبارەکانی دەوڵەتی گرتە ئەستۆ، ئوسامەو گەورە هاوەڵانی کۆکردەوەو بڕیاری دا، ئەو سوپایەی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە دووایین ڕۆژانی تەمەنی پیرۆزی خۆی پێکیهێنابوو، کۆببنەوەو بەرەو ئەرکە دیاریکراوەکەیان بکەونە ڕێ!!

بەم شێوەیە سوپاکە کۆکرایەوەو هاوەڵە گەورەکان بەشدارییان تێدا کرد، لە وادەی دەرچوونی، خەلیفە هاتە لای ئەمیری سوپا (ئوسامەی کوڕی زەید) و مۆڵەتی لێ خواست، کە: ئەگەر ڕێگا بدات، لەبەر پێویستی و هەستیاری کاتەکە، ئەوا عومەری کوڕی خەتاب ئیزن بدات و ڕێگەی بدات لە پاڵ خەلیفەدا لە مەدینە بمێنێتەوە؟!

ئوسامە ڕەزامەندی نواندو بەو جۆرە عومەر لە مەدینە مایەوە.

دوای ئەوە ڕۆژگار بەرەو پێشچوو، ئەبوبەکری صدیق گەڕایەوە بەر ڕەحمی خودای گەورەو عومەری کوڕی خەتاب لە جێگەیدا بووە خەلیفە، ئیدی هەموو بە ئەمیری ئیمانداران بانگییان کرد، کەچی









دوای ئەوەش ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی پێغەمبەری خـوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، کە چاوی بە ئوسامە دەکەوت، هەر بە ئـەمیر بانگی دەکرد!!

کاتێکیش یەك لە کوڕەکانی خەلیفە عومـەری کـوڕی خـەتاب بـە باوکی گوتبوو: چۆن دەبێ تۆلە سوپایەك بی، ئوسامە ئەمیری بـێ؟! ڕاستە ئەو زۆر باشە، بەڵام خۆ تۆ لەو لەپێشتری؟!

عومەر پێی گوت: وس بە قسەی وا مەکە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، باوکی ئوسامەی لە باوکی تۆ و ئوسامەشی لـە تـۆ خۆشتردەویست!! ئیتر دەتەوێ من بەوە ڕازی نەبم؟!

## خەلیفە موسڵمانان خزمەتکاری هەمووانن

تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵا دەگێڕێتەوە، دەڵێت: شـەوێکیان عومــەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لـێبێ)، لـە تاریکـایی شـەودا لـە مـاڵ هاتەدەر و بە نێو شاردا ڕۆشت، مـنیش دوور بـە دووری بـە دوویـدا چووم، گوتم: بزانم دەچێتە کوێ؟

عومەر ڕۆیشت ڕۆیشت گەیشتە ماڵێك، لـەو ماڵـە چـووە ژوور و پاشی ماوەیەك هاتەدەر، ئیدی گەڕایەوەو ڕۆشت.











منیش ئەو ماڵەم دەستنیشانکردو بۆ بەیانی هاتم سەری ئەو ماڵەم دا، دیتم پیرەژنێکی کوێر و پەککەوتەی لێیەو بەس؟!! سەیرم پێهات؟!! لێم پرسی: ئەو پیاوەی نیوە شەو هاتە لات، بۆچی هاتە لات؟!

پیرەژن وەڵامی دامەوە: ئەمە پیاوەکە ماوەیەکی ئەوەندەو ئەوەندەیە سەردانم دەکات، ئەو خواردن و شتانەم بۆ دێنێ، کە پێویستمن و دوایێ پاکم دەکاتەوە، ئینجا بەجێم دێلێت و دەڕوات!

## والی موسلمانان نابێ خراپترین والی بێ

لە ساڵی ڕەمادە (ئەو ساڵەی موسڵمانان لە سەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتاب - ڕەزای خوای لێبێ -) تووشی برسیەتی و قات و قڕییەکی ناخۆش بوون، خەلیفە عومەر بە تەنها نان و زەیتی دەخواردو هیچ شتەکی دی نەدەخوارد، ئەمە وای لێکرد ڕەش هەڵبگەڕێت، کز و لاواز بێت، بەڵام دیسانیش هەر شتی باشی نەخوارد ؟!

دەزانن بۆ؟!

لەبەر ئەوە نەبوو، کە نەیبوو و نەیدەتوانی خواردنی باش پەیدا بکات، بەڵکو ئەوەی هەیبوو، دەیدا هەژارانی میللەتەکەی،







دەیگوت: چۆن من خواردنی چەور و خۆش دەخۆم، لە کاتێکدا منداڵی موسڵمانان شتی باش نەبێ بیخۆن و بێناز بن؟!

لەو وتەکانیشی ـ کە بە باشی پەیڕەوی لێدەکرد ـ دەیگوت:

خراپترین والی و بەرپرس ئەو والی و بەرپرسەیە، خۆی تێر بێ و میللەتەکەیشی برسی بن.

## خەلیفە خۆی بەیتولمال دەپارێزێ

عەلی کوڕی ئەبی تالب (ڕەزای خوای لێبێ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێت: دیتم عومەری کوڕی خەتاب بەرەو دەرەوەی شار دەڕوات، لێم پرسی:

ئەوە بۆ کوێ ئەی ئەمیری ئیمانداران؟!

ئەمیری ئیمانداران وەڵامیدامەوە، گوتی:

وشترێکی بەیتولمال لەو وشترانەی هی صەدەقەنە بەربووەو ڕۆشتووە، منیش بەدوایدا دەڕۆم دەیگرمەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالب (ڕەزای خوای لێبێ)، دەڵێت، گوتم: بە ڕاستی خەلیفەکانی دوای خۆت ماندوو دەکەی!

هەر ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبی تالب، جارێکی دیکە دەچێتە لای ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی دووەمی پێغەمبەری خوا









(درودو سلاوی خوای لەسەر) عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوایان لێبێ)، لە بەیتولمال دادەنیشن و خەلیفە چراکە داناگیرسێنێ، بە تاریکی دادەنیشن.

ئیمامی عەلی دەپرسێ: بۆ چراکە داناگیرسێنی؟!

خەلیفە وەڵامی دەداتەوە: با بزانم ئیشەکەت چییە؟ ئەگەر ئیشی موسڵمانانە چراکە دادەگیرسێنم، ئەگەر ئیشی خۆشتە، بە تاریکی دادەنیشین، چونکە چراکە هی بەیتولمالی موسڵمانانەو نابێ بۆ بەرژەوەندی کەسی سوودی لێوەربگیرێ!

## لای موسڵمان هیچ شتێك لە خوا خۆشەویستتر نییە

سەحابەی بەڕێز تەلحەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێبێ)، جارێکیان لە نێو باغێکی خۆی نوێژ دەکات، لە پڕ باڵدارێك لە پێشی پەیدا دەبێ، لەم چڵ دەفڕێتە سەر چڵەکەی تر و بەم شێوەیە سەرنجی تەلحەی ئەنصاری بۆ ئەو باڵندەیە دەچێت، ئەمە وای لێدەکات نوێژەکەی لێتێکبچێت و نەزانێ چەند ڕکاتی کردووە، بۆیە زۆر شەرم لە خۆی دەکاتەوەو زۆر لەوە دەترسێ، کە خودای گەورە لەسەر ئەم هەڵەکردنەی سزای بدات؟!





ئەدی چی بکات؟! چۆن خۆی لەو گوناهە پاکبکاتەوە؟! بیردەکاتەوە چی بکات؟! چی بکات؟! سەر دێنێ و دەبا، کە چی بکات باشە بۆ ئەوەی خودا لێی خۆشببێت؟! سەرەنجام ڕای دێتە سەر ئەوەی ئەو باغەی بکاتە خێر و لە پێناوی خودا بیبەخشێ، مادام خۆشەویستی باڵدارێکی نێو ئەو باغەی بووە هۆی لێتێکچوونی نوێژەکەی، ئیدی بڕیار لەسەر ئەوە دەدات و یەکتاو دێتە لای پێغەمبەری خۆشەویستمان (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، پێی دەڵێت: ((ئەی پێغەمبەری خودا.. من لە نێو باغەکەمدا بە باڵدارێك خەریك بووم، تا وام لێهات لە بیرم کرد چەند ڕکات نوێژم کردووە، بۆیە من ئەو باغە دەکەمە صەدەقەی لە پێناوی خودا، ئیدی ئەی پێغەمبەری خودا تۆ بۆ چیت پێ باشە، وەهای لێبکە، من ئەوەم بە باش زانی، بەڵکو خودای گەورە ڕەحم پێبکات و لێم خۆشببێ))!

## خەلیفە و خانەوادەکەی

## هەر دیاریەکیان بۆ بێت، بۆ بەیتولماله

نێردراوی پاشای ڕۆم هاتە مەدینەو نامەیەکی لە پاشای ڕۆمەوە بۆ ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی دووەمی پێغەمبەری خودا (درودو سڵاوی خودای لەسەر)، عومەری کوڕی خەتاب هێنا، خەلیفەش نامەی خۆی بۆ پاشای ڕۆم ڕەوانە کردەوە، ئوموکەلسومی کچی عەلی کوڕی ئەبی تالبیش (ڕەزای خودایان لێبێ)، کە ئەو ڕۆژە یەك







لـە ژنـەکانی ئـەمیری ئیمانـداران عومـەری کـوڕی خـەتاب بـوو، دینارێکی قەرز کرد، بەو دینارە شوشەیەك بۆنی خۆشی کڕی، لەگەڵ نامەکانی خەلیفە بە دیاری بۆ ژنی پاشای ڕۆمی ڕەوانە کرد.

لە وەڵامی ئەمەدا ژنی پاشای ڕۆم پـاش ماوەیـەك یـەك تورەگـە زێڕی بە دیاری بۆ ئوموکەلسوم ڕەوانە کرد.

کە ئەم زێڕە گەیشتە ئوموکەلسوم، وەریگرتن و لە ماڵەوە لەسـەر بەڕەیەك لەو بەڕانەی لەسەری دادەنیشتن بڵاویکردنـەوە، تەماشـایان بکات، لەو کاتەدا خەلیفە عومەری کوڕی خـەتاب (ڕەزای خودایـان لێبێ) هاتە ژوور، کە چاوی بەم هەموو زێـڕە کـەوت، لێـی پرسـی: ئەمانە چینە؟

ئوموکەلسوم (ڕەزای خـودای لـێبێ) مەسـەلەکەی تێگەیانـد، کـە ئەمانە چینەو لە کوێ بۆی هاتوون.

خەلیفە کە ئەمەی بیست، هەڵسا هەموو ئەو زێـڕەی کـۆکردەوە، بردنی فرۆشتنی، لە پارەکەیان دینارێکی دایەوە ئوموکەلسوم، کە بۆ کڕینی بۆنەکە کاتی خـۆی قـەرزی کردبـوو، ئـەوی دیکەیشـی بـردە بەیتولمالی موسڵمانان.

بۆ ئـەوەی ژنـی خەلیفـە خـاوەنی زێـڕی بـەو زۆرییـە نـەبێت و خوانەخواستە ئەم شتە دونیاییانە خوداو قیيامەتی لە بیر نەبەنـەوە،









هەروەها بۆ ئەوەی ژنی خەلیفەی موسڵمانان لە کچ و ژنی موسڵمانان زێڕی زیاتر نەبێ، تا با کچ و ژنانی موسڵمانان هەیانبێ، بەڵام کچ و ژنی خەلیفە ئەو شتانەیان نەبێ، کە ئەوە بەرنامەی خوداناسانە لە ژیان، بەمە ئەو یاسایەی سەپاند، کە:

١- لە ئیسلامدا هاووڵاتی بۆی هەیە هەموو شتێکی هەبێ و ژیانی هەزار جار خۆشتربێ لە ژیانی خەلیفەو والییەکان، نەك بە پێچەوانەوە دەسەڵاتدار وەکو ئەمڕۆ پڕبێت و موسڵمانانیش هەژار و برسی بن.

٢- خەلیفە بۆچی ئەو کارەی کرد؟ بۆچی زێڕی ژنەکەی بردەوە بەیتولماڵ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە بیری کردەوە، گەیشتە ئەو ڕایەی: ئەو دیارییەی بۆیان هاتووە، بە هۆی پۆستی خەلیفایەتی بووە، دەنا بۆیان نەدەهات، کەواشبێ دەبێ دیارییەکە بۆ بەیتولمالی موسڵمانان بێ، نابێ هیچ والی و خەلیفەیەك سوود لە پۆستەکانی خۆیان بۆ خۆدەوڵەمەندکردن وەربگرن.

ئەوەش بووە یاسایێکی زێڕین لە دەوڵەتی ئیسلامی، ئێستاکە لە ئەمریکا و وڵاتانی پێشکەوتوو وەهایە، لە ماوەی سەرۆکایەتیدا سەرۆکی ئەمریکی هەر دیارییەکی بۆ بێت، دەبێ لە ئەرشیفی کۆشکی سپی تۆمار بکرێ و دیارییەکە بۆ کۆشک بێ، نەوەك بۆ









خـودی سـەرۆك.. بـەڵام بەداخـەوە سـەرۆك و پاشـاكانی جیهـانی ئیسلامی، كە ئیسلام بە ڕەجعییەت و خۆیان بە پێشكەوتوو دەزانن، لای ئەوان یاسای وەها بوونی نەمایەو هەرچی دەستیان كـەوێ، هـەر بۆ خۆیانە!!

شایانی باسە ئوموكەلسومیش (ڕەزای خـودای لـێبێ)، كـە كچـی عەلی كوڕی ئەبی تالبەو كچی فاتیمەی زەهـڕای كچـی پێغەمبـەری خودایە (درودو سلاوی خودای لەسەر)، ئەویش ئەو مەسەلەی زۆر بە ئاسانی وەرگرت و بێ ئەوەی توڕە بێـت، یـان ناڕەحەتیـەكی بەسـەر بێت، بەو كارەی خەلیفەی موسڵمانان و مێردە بەڕێزەكەی خۆی ڕازی بوو، ئیدی هەموو ژیانی وەكو پێشوو بـە زوهـد و خـۆدووركرتن لـە جـوانی و خۆشـییە ڕوواڵەتییـە ماددییـەكانی دونیـا بەسـەر بـرد، ڕەزامەندی خوداو قیيامەت و بەهەشتی نەبڕاوەی هەمیشە لـە دڵدا لە زێڕو زیو و لە هەموو خۆشییەكانی دونیا لەلا خۆشەویستتر بوو.

## خەلیفەی موسڵمانان مافی یەتیمان دەپارێزێ

ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی دووەمـی پێغەمبـەری خـوا (درودو سلاوی خوای لەسەر) عومەری كوڕی خەتاب (ڕەزای خـوای لـێبێ)، چووە ماڵێك چرایەكی خۆش دەسووتا، فـەرمووی ئـەو چـرایەتان لـە كوێ بوو؟









گوتیان: هی بابی ئەو منداڵانەیە!

فەرمووی: ئەدی بابی ئەو منداڵانە لە کوێیە؟

گوتیان: مردووە!

ئەمیری ئیمانداران گوتی: کەوابێ چرایەکە بکوژێننەوەو بەبێ چرا دابنیشن، چونکە ئەو چرایە هی ئەو منداڵە یەتیمانەیە، ئەوە هی بابیان نییە، پێشتر هەتا بابیان مابوو، ڕاستە هی وی بوو، بەڵام ئێستا کە بابیان نەماوە، ئیدی میراتی ئەو منداڵە یەتیمانەیەو نابێ ماڵی یەتیم بە فیڕۆ بدرێ و بە خراپ سەرف بکرێ!

## خەلیفەی موسڵمانان دەست بۆ ماڵی میللەت نابەن

١ـ ئەبوبەکری صدیق

مەبەست لە ماڵی میللەت ـ ئەو ماڵەیە، کە لە خەزێنەی دەوڵەتە، ئەوە هی موسڵمانان و خەڵکانی تری نێو دەوڵەتەکەیە - ئەمانەتێکی گەورەیە لە ئەستۆی بەرپرسانی وڵات و بە تایبەتیش خەلیفەو بەرپرسی یەکەمی وڵات، دەبێ بە باشی خەرج بکرێ و مافی هەموو گەورەو بچووکێکی وڵاتەکەی تیا پارێزراو بێ.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هیچ مووچەیەکی لە دەوڵەت نەبوو!!









ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێبێ)، کە بووە خەلیفە، هیچ مووچەیەکی لە دەوڵەت وەرنەگرت، بۆ بەیانی وەکو جاران چووە بازاڕ و ویستی کار بکات، صەحەبەکان پێیان گوت: شتی وا نابێ، تۆ خەلیفەی و کارت زۆرە، دواییش جوان نییە، تۆ بەو ئەرکەتەوە لە بازاڕ کار بکەی.

بۆیە بە زۆر مووچەیەکیان بۆ دەستنیشان کرد، ئەبوبەکر گوتی: باش.. بەڵام لە دڵی خۆیدا پێی ڕازی نەبوو، ئەوە بوو، لەسەر ماڵ و سامانەکەی خۆی دەژیا، ئەوەشی وەکو مووچە وەریدەگرت، لە لایەکی دادەنا، بەر لە کۆچی دوایی، بەو مووچەیە باغێکی کڕی، لە سەرە مەرگی بە خاتو عائیشەی کچی گوت: کچەکەم ئەو باغەی ئەوێم بە پارەی مووچەکەم کڕیوە، بە خوا کاتی خۆی، کە ئەو مووچەیەیان بۆ دانام، پێم خۆش نەبوو، بەڵام ناچاریان کردم، لەبەر دڵی براکانم قەبوڵم کرد، بەڵام مووچەکەم نەخوارد، ئەوەتا کۆم کردەوەو سەرەنجام ئەو باغەم پێ کڕی، لە پاشە من بیدەنەوە دەوڵەت و بیکەنە وەقفێك لە وەقفەکانی دەوڵەت.

٢ـ عومەری کوڕی خەتاب

ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی دووەمی پێغەمبەری خوا (عومەری کوڕی خەتاب)یش، لە سەردەمی خەلیفایەتی خۆیدا کە پێویستی







دەبوو، پارەی لە سەحابەکان قەرز دەکرد، جارێکیان یەك لە سەحابەکان (ڕەزای خوایان لێ بێ) پێی گوت:

ـ ئەی ئەمیری ئیمانداران خۆت خەلیفەیت و پارەی بەیتولمال هەمووی لەبەر دەستی خۆتە، ئیتر بۆچی لە بەیتولمالدا ئەوەندەی پێویستتە دەری ناهێنیت و بە قەرز لەسەر خۆتی بنووسی، دواتر کە هەتبوو بیخەیتەوە شوێنی خۆی، کەسیش پێی نازانێ، بۆ داوای قەرز لە خەڵك دەکەی؟!

ئەمیری ئیمانداران وەڵامی دایەوە: نەخێر من لە بەیتولمال قەرز ناکەم، چونکە ئەگەر مردم و پارەی بەیتولمالم بە قەرز لەسەر بوو، ئەوەی پاش من دێت، دەڵێت: ئەمیری ئیمانداران زۆر ماندوو بووەو با ئەو قەرزانەی لەسەر بکوژێنینەوە، چونکە ماڵی خۆتان نییە، بە ئاسانی لەسەرمی لادەبەن، بەوەش دەترسم خودا لێم قەبوڵ نەکات، چونکە ماڵی بەیتولمال نە بۆ من و نە بۆ کەسی تر حەلال نییە بە هەقی خۆی نەبێ، بەڵام کاتێك کە دەمرم، ئەگەر پارەی ئێوە قەرزار بم، ئەوا چەند ڕۆژێك پاش مردنەکەم دێنە لای منداڵەکانم و پێیان دەڵێن: باوکتان ئەوەندەمان قەرزار بوودو پێمانبدەنەوە! ئیتر دەتاندەنەوەو هیچم لەسەر نامێنێ!!







٣ـ عوسمانی کوڕی عەفان

هەمووماڵی خۆی بۆ ئیسلام دانا، بە ماڵی خۆی خزمەتی ئیسلامی دەکرد، نەوەك بە دینارێکی ئیسلام سوودی بە خۆی گەیاندبێت، ئاشکرایە کە ساڵی گرانییەکە، هەزار وشتری بە بارەوە دایە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی بەسەر هەژارانی دابەشبکات.

جاری دیکەش هەبوو، سوپایەکی بە تەنیا بە پارەی خۆی بۆ ئیسلام و موسڵمانان ئامادەکرد.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە بارەیەوەی فەرمووی: هیچ ماڵێك وەکو ماڵی عوسمان سوودی بە من نەگەیاند (واتە: بۆ خزمەتی بانگەواز و دینەکەی).. هەروەها فەرمووی: (لەمڕۆ بە دواوە عوسمان هەرچی بکات، زەرەری بۆی نابێ).

٤ـ عەلی کوڕی ئەبی تالب

کە بووە خەلیفە، ڕۆژێکیان یەك لە براکانی پێیگوت: ئێمەش هەژارین، شتێکمان لە بەیتولمال پێبدە.

عەلی (ڕەزای خوای لێبێ)، پێی گوت: زۆر باشە، شەو دوای نوێژی عیشا وەکو ئێرە چۆڵ بوو، وەرە بەیتولمال شتێکت پێدەدەم.










براکەی بە دڵی خۆش ڕۆیشت، (عەلی)ش پێش نوێژی عیشا هاتەوە بەیتولمال، پارچە ئاسنێکی لەسەر ئاگر دانا، چووە نوێژی عیشاو دوای ئەوەگەڕایەوە بەیتول مال، براکەشی لە دوای ئەو هات و سەلامی کرد، خەلیفە گوتی: کەس دیار نییە؟

براکەی گوتی: نەخێر.

خەلیفە گوتی: دە دەی دەستت بکەوە.

براکەی دەستی کردەوە.

خەلیفە عەلی ئاسنە سووروەبووەکەی بە مەقاشێك هەڵگرت و خستیە ناو دەستی، بەمە براکەی دەستی سووتاو لە هۆشە خۆی چوو!! دوای ئەوە بردیەوە ماڵ و پاش بەخۆهاتنەوەی، براکەی پێی گوت: باشە براکەم بۆ وەهات لێکردم؟!

خەلیفە عەلی گوتی: لەبەرئەوەی بزانی، ئەوە ماڵی میللەتە، دەست لێدانی بە خیانەت، ئاگری بەدواوەیە، جا ئەگەر تۆ بەرگەی ئاگری بچووکی دونیا نەگری، ئەدی چۆن من بەرگەی ئاگری گەورەی دوامایی بگرم؟!









٥ـ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

ئەم خەلیفە بەڕێزەش (ڕەزای خوای لێبێ).. کە خەلیفە بوو، جارێکیان دوو زەنبیل ڕوتابیان بۆ هێنا، (ڕەزای خوای لێبێ).. عومەر گوتی: ئەمە چییە؟

گوتیان: ڕوتابێکە ئەمیری ئوردن هەناردوویەتی.

گوتی: بە چی بۆ ئێرە هێنراوە؟

گوتیان: بە ئەسپەکانی پۆستەی دەوڵەت.

گوتی: کەوابێ من لە ئەسپەکانی پۆستەی دەوڵەت شیاوتر نیمە بۆ ئەو ڕوتابە، بڕۆن بیانبەنە بازاڕ و بیانفرۆشن، بە پارەکەی ئالیک بۆ ئەو ئەسپانە بکڕن، کە ئەو پۆست و نامانەی دەوڵەت دێنن و دەبەن.

برازایەکی ئەمیری ئیمانداران گوێی لەو قسانە بوو، چاوی لە پیاوەکەی ئەمیری ئیمانداران داگرت و پێی گوت: برۆ ئەو ڕوتابانە ببە بازاڕ، منیش لەگەڵت دێم، چەندیان پێ دا، تۆ مەیفرۆشە، من ئەوەندت دەدەمێ و لێتیان دەکڕم.

پیاوەکەی ئەمیری ئیمانداران گوتی: زۆرباشە.. دوای ئەوە دوو زەنبیلە ڕوتابەکەی هێنایە بازاڕ، لەوێ داینا بۆ فرۆشتن، چواردە درهەمیان پێدا، برازاکەی ئەمیری ئیمانداران ـ کە دڵنیابوو، زیاتر ناکەن ـ، چواردە درهەمەکەی دایە پیاوەکەی ئەمیری ئیمانداران و











دوو زەنبیلە ڕوتابەکانی لێ کڕی، دوای ئەوە چوونەوە، برازاکەی ئەمیری ئیمانداران یەك لە زەنبیلەکانی دایە پیاوەکەی ئەمیری ئیمانداران، پێی گوت: ئەوەیان بۆ مامەم ببە.. ئەوەشیان بۆ خۆم دەبەم.

پیاوەکەی ئەمیری ئیمانداران گوتی: زۆر باشە.. ئەو زەنبیلەیەی وەرگرت، کە برازاکەی ئەمیری ئیمانداران پێیداو بۆ ئەمیری ئیماندارانی هێنا، وەکو ئەمیری ئیمانداران چاوی بەو ڕوتابە کەوتەوە، زانی هەر ئەوەیە، کە پێشتر لێی نەخواردبوو و گوتبووی: برۆ بیبە بازاڕ و بۆ ئەسپەکانی پۆستەی دەوڵەتی بفرۆشە!! ئەدی باشە ئێستاکە بۆچی هەمان ڕوتابیان بۆ هێنایەوە؟!

عومەر پرسی: ئەوجارە چییە؟!

پیاوەکەی پێی گوت: یەکێکە لە دوو زەنبیلە ڕوتابەکان، لەگەڵ برازاکەت بردمانە بازاڕ، لەوێ چواردە درهەمیان پێدا، برازاکەت وەکو زانی زیاتر ناکات، چواردە درهەمەکەی پێدام و هەڵیگرتن، یەکیانی بۆ خۆی برد و ئەوەشیانی بۆ تۆ نارد، گوتی: ئێستاکە ئەوەیان بۆ مامەم ببە.







ئەمیری ئیمانداران بەوە دڵی خۆشبوو و بە پیاوەکەی گوت: ئێستاکە دەشێ ئەو ڕوتابە بخۆم!![1]

## موسڵمانان بڕوایان بە خۆشی و ناخۆشی هەیە

زانایانی موسڵمان گوتوویانە:

هەشت شت دەبێ بەسەر ئادەمیزاددا بێ، ئەو هەشتە بریتینە لە:

خۆشی و ناخۆشی..

کۆبوونەوە لەگەڵ دۆستان و لێکجیابوونەوە لەگەڵیان..

کاری ئاسان و کاری زەحمەت..

ساغی و نەخۆشی!

گرنگ ئەوەیە موسڵمان لە هەموو بارێکدا هەر موسڵمان بێ.



---

١ – محمد سعيد مرسي و قاسم عبدالله، ١٠٠ موقف من حياة العظماء، مؤسسة أقراء للنشر والتوزيع، ١٤٢٤ﻫ - ٢٠٠٣م، ص ١٣٢.







## ئەدەبی قسەکردن لە ئیسلامدا



زانایانی موسڵمان بە تێگەیشتن لە دەقەکانی ئاینی ئیسلام، چەند ئادەبەکیان بۆ قسەکردنی کەسی موسڵمان دەستنیشانکردووە، بە هەموویان موسڵمان دەکەنە تاکێکی ژیاری زۆر گەورە، ئەو ئادابانە بریتینە لە:

١ـ دەبێ ئامانجی قسەکە خێر بێت و بۆ خودا بێت.

٢ـ نابێ قسەکەر بە ناڕەوا قسە بکات و لە شتی پڕووپووچدا بدوێ.

٣ـ نابێ قسەکەر بکەوێتە نێو موجادەلەو بینەو بەردەی بێسوود لەگەڵ بەرامبەرەکەی، با ئەگەر لەسەر هەقیش بوو، چونکە ئەگەر بەرامبەر بە زوویی قەناعەتی نەکرد، ئەوا موجادەلەکردن بێسوودە.

٤ـ قسەکەر خۆی لەوە دووربخاتەوە، کە بۆ ئەوەی قسەیێك بکات، بێت زۆر لە خۆی بکات، جا ئەمە لەبەر زۆربڵێیی بێت، یان لەبەر خۆبەزلزانی، یان لەبەر هەر شتێکی دیکە، کە نەفسی دەیخوازێ.

٥ـ لە کاتی ئەوەی بەرامبەر قسە دەکات، بە باشی گوێی بۆ بگری و خۆت خەریك نەکەیت و وەکو پێویست تێکەڵاوی قسەکانی بیت.

٦ـ قسەکەر زۆر ئاگاداری خۆی بێت، نەکەوێتە غەیبەتکردنی خوشك و براکانی خۆی.







٧ـ قسەکەر خۆی لە نەمیمە بەدوور بگرێ و نەکات قسەی خەڵکی بۆ یەکتری بگوازێتەوەو بەمە قسەکانی فیتنەیان لێ بکەوێتەوە.

## ئامۆژگارییەکی بەسوود

یەك لە حەکیمەکان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات و پێی دەڵێت:

کوڕی خۆم.. ئەگەر لەگەڵ زانایان دانیشتی، با سووریت لەسەر ئەوە بێ، زیاتر ببیسی، نەك سووربی لەسەر ئەوەی زیاتر بڵێیت!!

بۆ ئەوەش، خۆت فێری باشترین شێوەی گوێگرتن بکە، قەتیش قسەیێك مەبڕە بەر لەوەی تەواوبێت.

## موسڵمان گۆشتی براکەی ناخوات

غەیبەتکردنی موسڵمان، واتە بە خراپ باسکردنی کەسێك، کە پێی ناخۆشە ، لە لای یەکێکی دیکە.. ئەوە غەیبەتەو یەکێکە لە گوناهە خراپەکان.

لە قورئانی پیرۆزدا غەیبەتکردنی برای ئیمانی بە خواردی گۆشتی ئەو برایە چووێنراوە، مادام گۆشتی براکەشت حەرامێکی زۆر تۆخ بێ، کەوابێ غەیبەتکردنیشی حەرامێکی زۆر تۆخە.












بۆیە ئیسلام و زانایانی ئیسلام قەت غەیبەتیان حەڵاڵ نەکردووەو هەمیشە بە کردەوەیەکی قێزەون و ناشرین وەصفیان کردووە.

جارێکیان ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم هەندێ کەس دەعوەت دەکا، کاتێك لەسەر سفرە دادەنیشن نان بخۆن، دەست دەکەن بە غەیبەت کردن، ئەویش بە هێمنییەوە پێیان دەڵێت: خەڵکانی پێش ئێمە، سەرەتا نانیان دەخوارد، ئینجا دەمیان بۆ گۆشت دەبرد، کەچی ئێوە لە سەرەتاوە، بەر لە نان خواردن، بە گۆشت خواردن دەستتان پێکرد. (سامر حشیمە، تسلیە الجالسین من قصص الصالحین، ص ٣٥)

بەڵام گۆشتەکە لە هونەری (جوانکاری)دا (موشاکەلە)یە، واتە: مەبەستی ئەوە نییە بڵێ: هەر لە سەرەتاوە بە خواردنی گۆشتی حەڵاڵی سەر برنجەکە دەست و پێکرد، مەبەستی ئەوەیە: بە غەیبەتکردن دەستتان پێکرد.

## بەلای موسڵمانانەوە:
## ئەڵڵا لە هەموو گەورەیەك گەورەترە

ئیمامی ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، کە شەوان هەڵدەستایەوە بچێتە مزگەوت بۆ شەونوێژ، جوان جوان خۆی پاك دەکردەوە، باشترین جلەکانی خۆی لەبەر دەکرد، بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا، ئینجا بەرەو مزگەوت دەهات.









دەیانپرسی: ئەی ئیمام.. بەو شەوە تاریکە بۆ بەو ڕەسمییە دێیە دەر؟!

دەیگوت: ئاخەر پیاو ئەگەر بچێتە لای کەسێکی دونیایی خۆی جوان دەکات، ئەدی ئەگەر بچێتە لای خودا چۆن دەبێ باشتر خۆی ڕێك نەخات؟!

## موسڵمانان لە بەهەشتی سۆز و وەفادا دەژین

ئەبوهوڕەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە ژوورێك دەژیاو دایکیشی لە ژوورێکی تر، هەر کاتێك بیویستبووایە بچێتە دەر، دەهات لە پێش دەرگای ژوورەکەی دایکی دەوەستاو پێی دەگوت: (سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکاتی خوداتان لەسەر دایکە).

دایکیشی وەڵامی دەدایەوە: (سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکاتی خودا لەسەر ئێوەش).

ئەبوهوڕەیرە دیسانەوە دەیگوت: (خودا ڕەحمت پێ بکا، وەکو ئەوەی بە بچووکی بەخێوت کردم).

دایکیشی پێی دەگوت: (خودا ڕەحم بە تۆش بکات، وەکو ئەوەی، کە بە تەمەندا چووم لەگەڵمدا باش بووی)!







ئیتر ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڕۆشت و هەردەمێکیش کە دەهاتەوە ماڵ، ئەمەی دووبارە دەکردەوە!

بەو شێوەیە ئەو ماڵە ببووە بەهەشتێکی بچکۆڵە، ئەم دایک و کوڕە تیایدا زۆر زۆر ئارام بوون.

ماڵە موسڵمانانی تریش هەروەهان.. ئەوانیش ئەوەی بە ڕاستی خودای ناسیبێ، هەروەها بوونەو هەروەهانە لەگەڵ یەك.

## شێخ شامل و سزاکەی دایکی!!

شێخ شاملی سەرکردەی شۆڕشی ئیسلامی قەوقاز لە دوای زنجیرەیەك شەڕی دوورودرێژی لەگەڵ داگیرکەری ڕووسی، ڕۆژێکیان دایکی بانگی دەکات و پێی دەڵێت: شامل کوڕم ئەم هەموو شەڕ و ماندووبونە بۆ؟! دە وەرە وازبێنەو لەگەڵ ئەو ڕووسانە ڕێك بکەوە!

شێخ شامل کە وازهینان لە خەبات لە پێناوی پارێزگاریکردن لە دینی خوداو حورمەتی موسڵمانان و خاك و وڵاتەکەی باب و باپیرانیان بە ئەرکێکی پیرۆز دەزانێت، ئەم داوایەی دایکی بەلاوە ستەمێکی گەورە دەبێت، چونکە چۆن دەبێت موسڵمانێك بڕوای بە خودا هەبێت و بەرگری لە عززەت و ئابڕوو و وڵات و پیرۆزییەکانی ئاینەکەی نەکات و بۆ دوژمنانی دین و وڵات بە چۆکدا بێت؟!









بۆیە لە دایکی زۆر توورە دەبێت و سوێند دەخوات دەڵێت: دەبێ سەد جەڵدەت لێبدەم، بۆ ئەوەی تێتبگەینم کە چ هەڵەیەکی خراپت کرد و تا هیچ موسڵمانێکیش نەوێرێت هەڵەی وەها بکات؟!

بەڵام دوای ئەوە کە توورەییەکەی بەسەر دەچێت و بە بیری دێتەوە، کە ڕێزی دایك لای موسڵمانان چەند گەورەیەو ئاینەکەمان چەند ڕێزی بۆ دایك داناوە، لە سزادانی دایکی پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام چۆن پەشیمان بێتەوە، خۆ ئەو سوندی خواردووە سەد جەڵدەی لێ بدات؟! بۆیە بۆ چارەسەرییەك پرس بە زانایان دەکات؟

زانایان سەرەنجام دەگەنە ئەو ڕایەی: ئەو سوێندە دەبێ جێبەجێ بکرێت، مادام حەزیش ناکەی لە دایکت بدەی، چونکە ئەوە ڕەتدەکەیەوە وەکو موسڵمانێك شتی وەها لە دەرهەق دایکت بکەی، کەوابێ دەبێ خۆت بەرگەی ئەو سەد جەڵدەیە بگری و فرمان بکەی ئەو جەڵدانە لە خۆت بدرێ!

شێخ شامل بەوە ڕازی دەبێت و ئیدی لە باتی دایکی سەد جەڵدەکە لەو دەدەن، بەمەش دڵخۆش دەبێ و سوپاسی خودا دەکات، کە بەمە سوێندەکەی لەسەر لاچوو و ڕزگاری بوو لەوەی ئەو بێئەدەبییە لەگەڵ دایکی بکات!!

## موسڵمانان مافی خوایان بەلاوە گەورەترە

لە ئەبا یەزیدی بوستامییەوە دەگێڕنەوە: گەنجێکی بیست ساڵە بووم، شەوێکیان دایکم بانگی کردم بچمە خزمەتی و لە ئازارەکانی کەم بکەمەوە، منیش چوومە خزمەتی، دەستێکم خستە ژێر سەری و دەستەکەی ترم بەسەر لەشی دادێناو سورەتی پیرۆزی ﴿قل هو الله أحد﴾م دەخوێند، لەپڕ ئەو دەستەم کە لەژێر سەری دایکمە بە ئێش کەوت، گوتم: دەست بۆ خۆمە، بەڵام مافی دایکم بۆ خودامە، بۆیە سەبرم لەسەر ئەو بارەدا گرت، تا خۆر دەرکەوت، ئیتر دوای ئەوە سوودم لەم دەستەم وەرنەگرت و پەکی کەوت!

دوای مردنی ئەبا یەزید، هەندێ لە دۆستانی لە خەودا دەیبینن، ئەوەتا لە نێو باغ و باغەتە سەوزەکانی بەهەشتدا دەفڕێت و تەسبیحات بۆ خودای گەورە دەکات!! لێی دەپرسن: بەچی ئەم ڕەحمەتەی خودات دەست کەوت؟!

وەڵامیان دەداتەوە: بە چاکە کردن لەگەڵ دایکم و ئارام گرتن لەسەر ناخۆشییەکان!

## موسڵمان مافی دایکیان بەلاوە گەورەیە

پیاوێکی سی ساڵە، پیرەژنێکی بە کۆڵەوەیەو بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا دەیسووڕێنێتەوە، تەوافی پێ دەکات، ئەم کارە کارێکی



زەحمەتەو ئارەقی شین و مۆری پێ دەکات، خەڵك بەوە سەرسام دەبن!
ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لێی دێتە پێش و لێی دەپرسێ:
ئەرێ ئەی عەبدوڵڵا ئەم پیرەژنە کێیە بە کۆڵتەوە؟

پیاوەکە وەڵامی دەداتەوە: ئەمە دایکمە، ئەوەش حەجی نۆیەمیەتی بەم شێوەیە پێی دەکەم!!

واتە ئەمە نۆیەم جارە، ئەم گەنجە بەو پشتەی خۆی حەج بە دایکی دەکات، ئەمجارە پیاوەکە لە ئیبن و عومەر دەپرسێت و دەڵێت: ئەی ئیبن و عومەر.. ئەی عەبدوڵڵا.. ئایا وام دەبینی هەقی دایکم دابێتەوە؟!

ئیبن و عومەر پێی دەڵێت: سوێند بەوەی محەمەدی بە هەق وەکو نێردراو و پێغەمبەر ڕەوانە کردووە، تۆ هەڵنەستاویت بە شتێك لە هەقی ئەو، تەنانەت هەقی ژانێك لەو ژانانەیت پڕ نەکردۆتەوە، کە لە کاتی لە دایکبوونتەوە دایکت بە هۆی تۆوە تووشی بووە!!

## موسڵمان دایکیان خۆشدەوێ

ئەبوهورەیرەی صەحابەی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، هەر جارێك لە ماڵ بهاتبووایەتە دەر، دەچووە لای دایکی،









پێی دەگوت: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکاتی خوا لەسەر تۆ ئەی دایکی خۆم.

دایکی وەڵامی دەدایەوە، دەیگوت: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکاتی خوا بەسەر تۆش کوڕی شیرینم .

ئەبوهورەیرە دەیگوت: ڕەحمەتی خوا لە تۆ دایکە، وەکو چۆن بە بچووکی ڕەحمت بە من کرد و منت پێگەیاند.

دایکی وەڵامی دەدایەوە، دەیگوت: ڕەحمەتی خوا لە تۆش کوڕی شیرینم، وەکو چۆن کە گەورە بوویت، چاکیت لەگەڵ من کرد و بەزەییت پێمدا هاتەوە.

## موسڵمانان دایکیان بەلاوە گرنگە

لە شاری جەددەی سعودی، گەنجێك لە مێژەوە عەشقی کچێك دەبێ، دوور بە دووری بۆ ئەو کچە دەسووتێ و هەمیشە دەستەو دوعا دەبێ، بەڵکو خوای گەورە ئەوەی لەگەڵ بکات و بەو کچەی شاد بکات؟!

سەرەنجام ئەو ڕۆژە دێتە پێش، دەچتە داخوازی کچە، کچەی پێدەدەن و بۆ ڕۆژی گوازتنەوەی بە دڵێکی خۆشەوە، ئاهەنگێکی گەورە ساز دەکات، خەڵکێکی زۆر کۆ دەکاتەوە، دایکی ئەو گەنجە







یەکجار بە ژنهێنانی کوڕەکەی دڵخۆش دەبێ، بە گەرمییەوە دێت و دەچێ و وا دەزانێ بوویتەوە چواردە ساڵی، ئەوەی ماندووبوون بێ هەستی پێناکات!! ئاخەر کوڕەکەی ژن دێنێ، ئیدی دایکی زاوا چۆن دەبێ لە ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆ ماندوو بێ؟! نەخێر ماندوو نابێت و وا دەزانێ، ڕۆژی لەمڕۆ خۆشتری لێ هەڵنەهاتووە!! ئەوەش دڵی زاواو دڵی ئامادەبووانیش زۆر خۆش دەکات، وەکو بەو شێوەیەی دەبینن، هەموو هاوسۆزی دەبن!!

بەڵام بوك بە تەنیا کەسێکە، کە ئەو خەسووەی بە دڵ نییەو بە بینینی بێزار دەبێت، بۆیە سەر دەباتە بن گوێی مێردەکەی و پێی دەڵێت: ئەوە چییە دایکت بۆ ئەوەندە دێت و دەچێت؟! دایکت زۆر عەشایرە!! عەیبە حەیای بردین، بڕۆ دەستی بگرەو بیکە دەرەوە!!

کوڕە بەو قسەی ژنەی گەلێك کارتێکراو دەبێ، هەڵدەستێ، دەچێ مایکرۆفۆنەکە لە دەست دەگرێ و هاوار دەکات: کێ دایکم لێ دەکڕێت؟!

هەموو ئەو قسە کتوپڕە چاوەڕوواننەکراوەیان زۆر پێ سەیر دەبێ و کەس وەڵامی ناداتەوە؟!

دیسانەوە بۆ جاری دووەم و جاری سێیەمیش هەمان قسەی دووبارە دەکاتەوە!! بەڵام خەڵکەکە ناڕەحەت دەبن و دیسانیش کەس وەڵامی ناداتەوە!! بۆیە کوڕە دەستی دایکی دەگرێ بیباتە دەرەوە



ڕوو لە ژنەکەی دەکات، پێی دەڵێ: من چوومەوە لای دایکی خۆم و تۆش بڕۆوە لای دایکی خۆت!!

ئەو جارە بوکەکەش و خەڵکەکەش سەرسام دەبن؟! ئاخەر ئەوە چی دەبیسن؟! بەڵام کوڕە دەڵێ: سەرسامی پێ ناوێ، ئەو ژنە هێشتا هیچ نەبووە بەو دڵخۆشییەی دایکم دڵی تەنگەو دەڵێ: دەستی بگرە بیکە دەرەوە، نەوەڵڵا من دەستی دایکم دەگرم و لەسەر سەری خۆمی دادەنێم، بەڵام ژنی وەکو ئەو، گەر بە دایکم ڕازی نەبێ، ئەو لە ماڵی خۆم دەکەمە دەر!!

ئیدی زاوا لە پێش چاوی هەمووان ژنەکەی تەڵاق دەدات و لەگەڵ دایکی دەچنەوە ماڵی خۆیان، پەشیمانییەکی باشیش لەوە دەردەبڕێ، کە بە قسەی کەسی نەکردو خۆی بەهەڵەبرد، ئەگینا پێیان گوتبوو: کاکە ئەو ژنە با جوانیش بێ، بەڵام ڕوحی گەورەیەو بە کەڵکی تۆ نایێ!! کەچی ئەو بڕوای نەکردبوو و گوتبووی: شتی وا نابێ!! بەڵام ئێستا بۆی دەرکەوت قسەی خەڵکی ڕاستەو ئەزموونی خەڵکی لەسەر بۆش دانەمەزراوە!!












## ڕێزگرتن لە دایك و باوك

لە (عەمرِی کوڕی زەڕ)یان پرسیوە: کوڕەکەت لەگەڵ تۆ چۆنە؟

وەڵامی داونەتەوە، گوتی:

قەت لە ڕۆژدا بە ڕێدا نەڕۆشتوومە، ئیللا ئەو لە دوامەوە بووە.. قەتیش لە شەودا بە ڕێدا نەڕۆشتوومە، ئیللا ئەو لە پێشمەوە بووە.. قەتیش نەچووەتە سەر بانێك، من لە ژێرەوەی بووبم.

## موسڵمان لە مردن بێ ئاگا نابێ

سەلمانی فارسی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: تەعەجوب بۆ ئەو کەسەی مردن داوای دەکات و ئەویش ئومێد بە دونیاوە دەبەستێ!!

بۆ ئەو کەسەی لە مردن بێ ئاگایەو مردن لەو بێ ئاگا نییە!!

ئەو کەسەی پێدەکەنێ، بەڵام نازانێ خودا لێی ڕازییە، یان لێی توڕەیە؟!

## موسڵمانان غەمی ڕزقیان نییە

موئەڕڕەقی عیجلی دەمی پرسیار و ئامۆژگاری دەکاتە خەڵکی بە گشتی و موسڵمانانی کەم حاڵی بە تایبەتی، پێیان دەڵێت:







ئەی ئادەمیزاد ئەوە تۆ چیتە؟! ڕۆژانە ڕزقت بۆ دێت، کەچی بۆ ڕزقت غەمباری و هەر بیر لە ڕزق دەکەیەوە؟! بەڵام لەولاوە تەمەنت کەم دەبێتەوەو بەرەو قیامەتی خۆت دەڕۆیت، ئینجاش غەمی بۆ ناخۆی؟!

موئەڕڕەقی عیجلی بەم ئامۆژگارییەی دەیەوێ بڵێ: ئاسوودەیی ئادەمیزاد لەوە دایە، ئیماندار بێ، ئەگەر ئیمانداریش بێ ئیمانداری ڕاستەقینە بێ، بڕواو متمانەی بە ڕازقیەتی خودا گەورە بێ، بەوە ئاسوودە دەبێ، بەوە ئیمان دامەزراو دەبێ، غەمی دونیای نابێ و خودا ڕزقی باشی بۆ دەنێرێ، ئەگەریش وەها نەبێ، ئەوە دڵتەنگ و ناڕەحەت دەبێ و ئەوەشی دەست ناکەوێ، کە خەوی پێوە دەبینێ.

موسڵمانی ڕاستەقینە هەمیشە وەها ژیاون و هەمیشەش وەها دەژین.. بەوە ئاسوودە بوون و بەوەش ئاسوودە دەبن.

## موسڵمانان هەقپارێزن

محەمەدی کوڕی مونکەدیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) هەندێ کراسی هەبوو، لە دوکانەکەی دانابوون و شاگردێکی هەبوو بۆی دەفرۆشتن، ئەو کراسانە دوو جۆر بوون، جۆرەکیان بە پێنج درهەم و جۆرەکەی تریان بە دە درهەمی بوو!!







ڕۆژەکیان ئەو شاگردەی هەڵە دەکات و یەك لە کراسە پێنج درهەمییەکان بە دە درهەم دەفرۆشێت!!

محەمەدی کوڕی مونکەدیر وەکو دێت و ئەوە دەزانی، زۆر غەمبار دەبێ، ئیدی پرسیاری کڕیارەکە دەکات و ماوەیەکی باش سۆراغی دەکا، هەتا دەیدۆزێتەوە، ئەو کاتی پێی دەڵێ:

- ئەری کاکە تۆ فلانە ڕۆژی کراسێکت لە دوکانەکەی من کڕیوە، ئەو کراسە نرخەکەی پێنج درهەم بووە، بەڵام شاگردەکەم بە هەڵە دە درهەمی لێوەرگرتووی!!

کابرای کڕیار دەڵێ: ئینجا ئەوە چییە برا؟! کاتی خۆی بەو نرخە ڕازی بوومەو تەواو!!

محەمەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: نەخێر برام.. ئەوە ئەگەر ئەتووش پێی ڕازی بی، من پێی ڕازی نابم، چونکە هەقی کراسەکە پێنج درهەمەو دە درهەم نییە!! لۆیێ ئێستاکە سێ ڕێگەت لە پێش دا دەنێم و دەبی یەکیان هەڵبژێری، ئەوانیش: یان کراسەکەت دینیەوەو یەکەکی دە درهەمی دەبەی!! یانیش پێنج درهەمە زیادەکەت دەدەینەوە!! یانیش کراسەکە دینیەوەو هەر دە درهەمەکانت وەکو خۆی دەدەینەوە!!

کابرای کڕیار گۆتی: کاکە پێنج درهەمە زیادەکەم بدەنەوە.











محەمەدی کوڕی مونکەدیر پێنج درهەمەکەی دەداتەوە، ئیدی دەڕوات و کابرای کڕیار محەمەدی لە بەر چاو زۆر گەورە دەبێ، دەپرسێ: ئەوە کێیە؟!

دەڵێن: محەمەدی کوڕی مونکەدیرە.

کابرا دەڵێ: وەڵڵاهی پیاوێکە، جێی خۆیتی ئەگەر قاتی و قڕیمان بەسەردا هات و باران نەباری، بەوە بڵێین دوعامان بۆ بکات!! ئاخەر ودرە پیاو ئەتوو ئەوەندە موسڵمان و لە خواترس و هەقپارێزبی، نەیێڵی هەڵەشت بەسەردا تێپەڕێت؟!![2]

## فرمانی خوا لەسەروی هەمووانە

پیاوێکی قیبتی لە خەڵکی میسر، هاتە لای خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێی گوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. من لەگەڵ کوڕەکەی عەمری کوڕی عاصی والی میسر پێشبڕکێمان کرد، لەو پێشبڕکێیە من بە پێشە وی کەوتم، ئەو توڕە بوو و بە قامچیەکەی خۆی، لێی دام!! پێی گوتم: من کوڕی دوو بەڕێزترینەکانم!!

---

٢ – سەرچاوە: کتێبی (١٠٠ موقف من حياة العظماء)، دانانی: محەمەد سەعید و قاسم عەبدوڵڵا، مؤسسة أقراء للنشر والتوزيع والترجمة، ١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣م.



خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ)، کە ئەو بێدینییەی بیست، توڕە بوو، نامەیەکی بۆ عەمری کوڕی عاصی والی میسر نووسی، تیایدا هاتبوو: ئەگەر ئەو نووسراوەی من گەیشتە لای تۆ، خۆت و کوڕەکەت وەرنە لای من.

کاتێکیش عەمر و کوڕەکەی هاتنە لای خەلیفە، عومەری کوڕی خەتاب بە توڕەییەوە تەماشای کردن و پێی گوتن: (ئەوە ئێوە لە کەیەوە خەڵکتان بە کۆیلە گرتووە؟! لە کاتێکدا دایکەکانیان بە ئازادی بۆ دونیایان هێناون)؟!

ئینجا قامچیەکی دایە دەست پیاوە قیبتییەکەو پێی گوت: ها.. لە کوڕی دوو باشترینەکان بدە.

ئەمە بۆ ئەوەی کەس لە حوکمی خوا گەورەتر نەبێ و فرمانی خوا لەسەرووی هەموو فرمانەکان بێ، عەمری کوڕی عاص و کوڕەکەشی داوای عەفویان کرد و بڕیاریان دا، جارێکی تر، شتی وا دووبارە نەبێتەوە.

## موسڵمان هەمیشە براکانی وشیار دەکاتەوە

شەوێکیان پیاوێك هاتە لای ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی چوارەمی پێغەمبەر خوا عەلی کوڕی ئەبی تالب (ڕەزای خوای لێ



بێ)، پێی گوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران خانوێکم لە پیاوێك کڕیوە، حەز دەکەم بە دەستی خۆت گرێبەستی کڕینەکەیم بۆ بنووسی!

ئەمیری ئیمانداران تەماشای ئەو پیاوەی کرد؟! هەستی کرد دونیا باڵی بەسەر دڵیدا کێشاوە، بۆیە ویستی دەرسێکی بدات، خوای گەورەی بە بیربێنێتەوە، ئیتر دەستی دایە قەڵەم و نووسی:

لە دووایدا:

مردوێك خانوێکی لە مردوێك کڕی، ئەو خانووە دەکەوێتە وڵاتی گوناهکاران و لەسەر ڕێگای بێئاگایان، چوار سنووری هەیە، یەکەمیان بە مردن کۆتایی دێت! دووەمیان بە گۆڕ، سێیەمیان بە لێپرسینەوەو چوارەمیشیان بە بەهەشت و یان بە ئاگر!!

وەلسەلام و عەلەیکوم وەڕەحمەتوڵڵا

## موسڵمانان هەقی خۆیان وەردەگرن

دەگێڕنەوە: جارێکیان کابرایەك دێتە لای ئیبن و تیمییەی زانا، پێی دەڵێت: من هەر ئیش دەکەم و هەر پارەکەم بەشم ناکات.

ئەویش لێی دەپرسێ: چ ئیشێك دەکەی و بە چەند؟

کابرا دەڵێ: فڵانە ئیش دەکەم و ڕۆژانەم شەش درهەمە!



ئیبن و تەیمییە پێی دەڵێ: لەمەولا ڕۆژانە سێ درهەم وەربگرە.

کابرا دەڵێ: ئاخەر ئیمامی بەڕێز من شەش درهەم وەردەگرم و بەشم ناکات، ئێستا سێ درهەم من دەگەیەنێتە کوێ؟!

ئیبن و تەیمییە پێی دەڵێ: ئەگەر دەتەوێت پارەکەت بەشت بکات، وەکو پێت دەڵێم وەها بکە.

کابرا دەڕوات و بە ناچاری بە قسەی دەکات، پاش ماوەیەک هەست دەکات پارەکەی بەشی دەکات و زیاد دەکات و پاشەکەوتیشی دەبێت، ئەمەی گەلێك بەلاوە سەیر دەبێ!! دێتەوە لای ئیمام و پێی دەڵێت:

- ئیمامی بەڕێز.. وام زانی بە قسەکەی تۆ بکەم، زەرەرردەکەم، کەچی خۆ ئەوەتا بە قسەی تۆم کرد، نەك هەر زەرەرم نەکرد، بەڵکو پارەکەم بەشی کردم و زیادیشی کرد!! پێم نالێی نهێنی ئەوە چی بوو!!

ئیمام پێی گوت: کاکە وەکو لێی وردبوومەوە، تۆ زۆرترت لەوە وەردەگرت، کە هەقی خۆتە، بۆیە پارە زیادەکە بەرەکەتی هەقەکەشتی دەبرد و بەشی نەدەکردی، بەڵام کە گوتم سێ درهەم کەمبکەوە، مەبەستم ئەوە بوو، زیادە وەرنەگری و ئەوەی وەری دەگری، ئارەقی نێوچەوانی خۆت بی، چونکە ئەوەماڵی حەڵاڵە









بەرەکـەتی تێدەکـەوێ، تـۆش چـوویت وەهـات کـرد، بۆیـە ئێسـتا پارەکەت زیادی کردو دڵت ئاسوودە بوو و پاشەکەوتیشت بوو!!

## موسڵمان بەڵای بۆ خۆی قەبوڵە، نەک بۆ کەسێکی تر

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مزگەوتی قیبلە ڕاست، لە هـەولێر، جارەکیان بە بن دیواری قـەڵاتێ دا تێپـەڕیبوو، پارچـە کەرپووچـەك هاتبووە خواری و بەر سەری کەوتبوو، بەو هۆیـەوە چـەند ڕۆژەك لـە ماڵێ کەوتبوو، خەڵك کـە ئـەوەیان زانـی بـوو، زۆریـان سـەردانیان کردبوو، یەکەك گوتبووی: خۆزگە مامۆستا ئەو کەرپووچـە بـە تـوو نەکەوتبووایە!!

مامۆستا وەڵامی دابووەوە: کورە ناوەڵڵا بە خوای چاك بوو بە مـن کەوت، ئەمن لۆ خۆم وا لە ماڵێ دانیشتیمەو چ عەیبم نییـە، بـەڵام ئەگەر بە کرێکارەکی فەقیر بکەوتبووایە، ئـەو وەکـی ئێسـتای مـن بکەتبووایەوە ماڵێ، کێ ئێواران رزقەکی لۆ منداڵەکانی دەبـردەوە!! لۆیێ لێگەڕێ کاکە، خوا بە خۆی باشتر دەزانی!!









## موسڵمانان بەسەبرن

سەرچاوەکان دەگێڕنەوە: بە موسڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لەسەر)، قوڕەیش ئیتر هەرچی ئومێدێکی هەیبوو، لەنێوچوو!! چونکە دوای ئەوەی چەند ڕۆژێکی کەم بەسەر موسڵمانبوونی ئیمامی حەمزە (ڕەزای خوای لەسەر) تێپەڕی بوو، ئەمجارە قوڕەیش گوێیان لە دەنگی عومەری کوڕی خەتاب بوو (ڕەزای خوای لەسەر)، کە هاتۆتە نزیك کەعبەی پیرۆز و بە دەنگی بەرز موسڵمانبوونی خۆی ڕادەگەینێ، ئەوەتا لە پێش خەڵکانێکی ئامادەبووی ئەو شوێنە پیرۆزە هاوار دەکات و دەڵێت: من پاڵپشتی لە محەمەد دەکەم (درودو سڵاوی خوای لەسەر) و کاردەکەم بۆ ئەوەی ئاینەکەی سەربکەوێت، تا مردنیش لەو بەرگریەم لە پێغەمبەر و ئاینەکەی (درودو سڵاوی خوای لەسەر) بەردەوام دەبم.

کاتێك ئەبوجەهل و سەرۆکەکانی دیکەی قوڕەیش گوێبیستی ئەم موسڵمانبوونەی عومەری کوڕی خەتاب بوون، زۆریان پێ ناخۆش بوو؟! بەڵام موسڵمانان بە هۆی موسڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لەسەر)، زۆر دڵخۆشبوون، بە هۆیەوەی دڵنیایی و متمانەیان بە خۆیان زۆرتر بوو، ئیتر وایلێهات بەبێ ترس بە شەقامەکانی شاری (مەککە)دا دەهاتن و دەچوون و بە ئاشکرایی قورئانی پیرۆزیان دەخوێند.









ئەو کۆیلەو عەبدانەی موسـڵمانیش ببـوون، ئـیتر سـەری خۆیـان بەرزکردبۆوە، سەربەرزبوون بە موسـڵمانبوونی خۆیـان، بـە سـەحابە بەهێزەکانی پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) پشت ئەستوور بوون و وای لێهات کەس نەیدەوێرا، وەکو جاران یـەك لەمانـە ئـازار بدات.

ئیدی پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسـەر) بـە ڕێگەوبانـەکانی مەککەدا دەهات، حەمزە لە دەستەڕاستی و عومەر لە دەستە چەپی بـوون.. سـەرۆکەکانی قورەیشیش سـەیریان دەکـرد و داخیـان لـێ دەخوارد؟! بیریان لەوە دەکردەوە، چۆن شێوازێکی دیکە بدۆزنەوە، بۆ دژایەتیکردنی پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر)؟! هەروەها بـۆ ئەوەی سنوورێکیش بۆ ئەم ئاینە نوێیـە دابنـێن و نـەیێڵن چیدیکە شوێنکەوتووانی زیاد بکات؟! کەوابێ با بە وردی بیر لەو مەسەلەیان بکەنەوەو بە دوای فێڵێکی نوێدا بگەڕێن؟!

بۆیە بڕیاریان دا، هەر بەیانی کۆبوونەوەیێك بگرن، تیایدا لـەبارەی محەمەد و مەسەلەی گەورەبوونی ئاینەکەی بیرورا بگۆڕنەوەو بڕیار بـۆ بچووککردنەوەی بدەن؟!

بەیانی هات و کۆبوونەوە، دوای زنجیرەیێك بیروڕای لێکجیا، هاتنـە سەر ئەوەی، محەمەد (درودو سڵاوی خوای لەسـەر) بکەنـە سـەرۆکی





حکومەتی شاری مەککە، بەڵکو بەم هۆیە وازبێنێ و چیدیکە داب و نەریتەکانی ئەوان پووچ نەکاتەوەو ئیشەکانیان لێ تێك نەدات؟!

بۆ ئەو مەبەستە وەفدێکیان هەناردە لای، بۆ ئەوەی لەم بارەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ بکەن. کە گەیشتنە لای، یەکێکیان پێی گوت:

- ئەی باوکی قاسم.. ئەوەی تۆ لە سوکایەتیکردن پێمان دەیکەی، پێمان قەبوڵ ناکرێت؟! ئەوەی تۆ هێناوتە نێو قەومەکەت، نەمانزانیوە هیچ پیاوێکی دیکەی عەرەب بەسەریدا هێنابن، تۆ جوێنت بە باب و باپیرانمان دا؟! عەیبت لە دین و خوداکانمان گرت؟! خەونەکانمانت لەبار برد؟! کۆمەڵ بووین و لەبەریەکت هەڵوەشاندینەوە؟! ئیتر هیچ شتێکی خراپ نەماوە، لە نێوان ئێمەو خۆتدا نەتخستبێ؟! باشە ئەگەر ماڵ و سامانت دەوێ؟ لە ماڵ و سامانی خۆمان ئەوەندەت بۆ کۆدەکەینەوە، تا دەبیە دەوڵەمەندترینی هەموومان!! ئەگەریش دەتەوێت شان و شکۆیێکت لە نێو ئێمەدا هەبێ، ئەوا دەتکەینە سەرۆکی خۆمان!! ئەگەریش حەزت لە پاشاییتییە، دەتکەینە پاشای خۆمان!!

پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) کەمێ سەری موبارەکی هەژاند، پاش ئەوە تەماشای کردن و بە ئیمان و بڕواییێکی گەورەوە پێی گوتن: (ئەوەم نییە کە دەیڵێن.. بەوەی بۆم هێناون، بۆ ئەوە نەهاتووم داوای ماڵ و سامانتان بکەم، یان داوای شان و شکۆ لە







نێوانتان و یان داوای پاشایەتی بەسەرتانەوە بکەم.. بەڵام خودا منی بە پێغەمبەر بۆ ئێوە ناردووە، جا ئەگەر ئەوەم لێ قەبوڵ بکەن، کە بۆم هێناون، ئەوە بەختی ئێوەیە لە دونیاو دواماییی، ئەگەریش بەسەرمیدا بدەنەوە، بۆ فرمانی خوا صەبر دەگرم، تا خودا حوکم لە نێوان من و ئێوەدا دەکات).

دوای ئەوەی بینییان پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) داواکانی ڕەتکردنەوە، ئەمجارە داوایان لێکرد، پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) واز لە خوداکانی ئەوان بێنێ، ئەوانیش جوێن بە خودای پێغەمبەر نادەن، پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) ئەم داوایەی قەبوڵ کردن، بەڵام قوڕەیشیەکان ویستیان زیاتر پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە خۆیان نزیکبکەنەوە، ئەوەبوو درێژەیان بە داواکانیان داو ئەوجارەیان گوتیان: (محەمەد وەرە با لەو مەسەلەیەدا پێکەوە شەریك بین، ئێمە ڕۆژێك خودای تۆ دەپەرستین، تۆش ڕۆژێك خوداکانی ئێمە بپەرستە، بەمە ئەگەر ئەوەی تۆ دەیپەرستیت خێری تێدابێت، پشکێکمان بەردەکەوێت، ئەگەریش ئەوەی ئێمە دەیپەرستین خێری تێدابێت، تۆ پشکێکت بەردەکەوێت.).

پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) ئەوەی زۆر بە توندی ڕەتکردەوە، خوای گەورەش سوڕەتی پیرۆزی (الکافرون)ی دابەزاند..









﴿بسم الله الرحمن الرحيم.. قل يا أيها الكافرون * لا أعبد ما تعبدون * ولا أنتم عابدون ما أعبد * ولا أنا عابد ما عبدتم * ولا أنتم عابدون ما أعبد * لكم دينكم ولي دين﴾.

دوای ئەمانە، کە ئەم هەموو فڕوفێڵانەی قورەیش بێبایەخ و مایە پووچ بوون، ئەمجارەیان بیریان لە شێوازێکی نوێ کردەوە، بۆ ئەوەی بە خەیاڵی خۆیان بەم هۆیەوە پێغەمبەر (درودو سلاوی خوای لەسەر) لەگەڵ سەحابەکانیشی لەناو ببەن. ئاخەر ئازاردان و لەخشتەبردن و گفتوگۆ و هەموو ئەو شێوازانە چ سوودێکی پێ نەگایندن و محەمەد (درودو سلاوی خوای لەسەر) تا دێت سەحابەکانی زۆرتر دەبن و تا دێت زیاتر ناوبانگی خۆی و ئاینەکەی بلاودەبێتەوە، ئەمەش بێگومان لەسەر حسێبی بچووکبوونەوەو تیاچوونی دەسەڵاتی قورەیشیەکانە، ئەدی کەوایە قورەیش چی بکات؟! چۆن دەتوانێ وەها بمێنێتەوەو چاوەڕووانی ئەوە بکات، کەی بۆ یەکجارەکی پێغەمبەر (درودو سلاوی خوای لەسەر) لەگەڵ سەحابەکانی موژدەی مەرگی قورەیش و تیاچوونی دەسەڵات و زۆر و ستەمەکەیانیان پێ ڕابگەیێنێ؟!

نا... ئەوەیان پێ قەبوڵ ناکرێ!!!

کەوابێ دەبێ قورەیش شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەی بگۆڕێ و بە جۆرێکی تر پێش لە گەورەبوونی ئەم ئاینی ئیسلامە نوێیە



بگرێتەوە!! باشە ئەمجارە چی بکات؟! بیریان کردەوە، گەیشتنە ئەو بڕیارەی، ئەمجارەیان گەمارۆی ئابوری بخەنە سەر محەمەد و یارانی، لە شار وەدەریان بنێن، شتیان پێ نەفرۆشن و شتیان لێ نەکڕن، ژنیان پێ نەدەن و ژنیان لێ نەهێنن!!

بەوە موسڵمانان کەوتنە دۆلی ئەبی تالیب.. سێ ساڵیش لەوێ مانەوە، بەرگەی برسییەتی و هەموو ناڕەحەتییەکی دیکەیان گرت، سەرەنجام قوڕەیش بەزی و ئەوان سەربەرز و سەرفراز دەرچوون!!

## موسڵمانان

## چاکەی کەس لەبیر ناکەن

کە جوبەیری کوڕی موتعیم موسڵمان بوو، پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) پێی دڵخۆش بوو، موتعیمی باوکی جوبەیر ئەو پیاوە بوو، کە پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە تائیف گەڕایەوەو قوڕەیش نەیانهێشت بێتەوە ناو شار، پەنای داو هێنایەوە ناو شار، بۆیە ئەم هەڵوێستەی بە چاکی و پیاوەتییەکی گەورە بۆ تۆمار کرا.

کە لە جەنگی بەدردا کۆمەڵێك لە قوڕەیشییەکان بە دیل گیران و کەوتنە لای پێغەمبەر و موسڵمانان (درودو سڵاوی خوای لەسەر)،







ئەو کاتە جوبەیر هات لە بارەی ئەو دیلانەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) پێشوازییەکی گەرمی لێکردو پێی فەرموو: (لو کان الشیخ أبوك حیا، فأتانا فیهم، شفعناه).. واتە پێی فەرموو: گەر بێت و باوکە پیرەکەت ئێستاکە زیندوو بووایەو بۆ ئەو دیلانە بهاتبووایە لامان، شەفاعەتەکەیان قەبوڵ دەکرد.

## موسڵمان دواماییان بەلاوە لە دونیا نزیکترە!

فوزەیلی کوڕی عەبدولوەهاب دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان گوێم لە برایێکم بوو، دەیگوت: دوامایی نزیکترە لە دونیا! ئەمە چونکە ئادەمیزاد کارێکی دونیایی دەبێت، لەوانەیە بۆ ئەوە سەفەرێکی بکەوێتە پێش، لەو سەفەرەیدا بێگومان بە لاشە ماندوو دەبێت و پول و پارەییێکیشی بۆ خەرج دەکات، ئینجا لەگەڵ هەموو ئەوەشدا دەشێ سەرەنجام نەگاتە ئامانجەکەی خۆی!! بەڵام ئەگەر ئادەمیزاد دوامایی ویست، ئەوا وەدیهێنانی داواکەی بەستراوەتەوە بە نیازەکەی، ئیتر نە سەفەری پێویست دەبێ، نە بە لاشە ماندوو دەبێ؛ نە پول و پارە خەرج دەکات، هەر هێندەیە گوێڕایەڵی خودا دەکات و ئیتر ئەوەی دەست دەکەوێ، کە وا لە لای خودا هەیە!! (صفه الصفوه، أبن الجوزی، ٢/٩٩...)







## موسڵمانان نەتەوەیەكی گەورەن

لە یەكێ لە غەزوەكان چوار سەحابەی بەڕێز بریندار دەبن و داوای ئاو دەكەن، یەكێك دێت ئاویان بۆ دێنێ، بۆ یەكەمیانی دەبا، یەكەمەكە سەیر دەكا براكەی ئەولای داوای ئاو دەكا، ئیتر نایخوات و دەڵێ: بیبە بۆ ئەم برایەم.

ئاوەكە بۆ ئەم دەبات، ئەویش سەیر دەكا براكەی ئەولای داوای ئاو دەكا، بۆیە ئەمیش نایخوات و دەڵێ: بیبە بۆ ئەم برایەی ئەوێم.

ئاوەكە بۆ ئەوەی سێیەم دەبات، ئەویش سەیر دەكا براكەی ئەولای داوای ئاو دەكا، بۆیە ئەویش نایخوات و دەڵێ: بیبە بۆ ئەم برایەی ئەوێم.

ئاوەكە بۆ ئەوەی چوارەم دەبات، ئەویش سەیر دەكا براكەی ئەولای داوای ئاو دەكا، بۆیە ئەمیش نایخوات و دەڵێ: بیبە بۆ ئەم برایەی ئەوێم.

كابرا بەم شێوەیە ئاوەكە بۆ برینداری یەكەم دێنێتەوە، وەكو تەماشای دەكات شەهید بووە؟! بۆ ئەوی دووەمی دەبات، دەبینێ ئەویش شەهید بووە؟! بۆ سێیەمی دەبات، دەبینێ ئەویش شەهید بووە؟! بۆ چوارەمی دەبات، دەبینێ ئەویش شەهید بووە؟!









بەم شێوەیە هەر چوار بریندارەکان، کە صەحابەی پێغەمبەری خوا بوون (درودو سڵاوی خوای لەسەر) گەورەییان نواند، لەبەر ڕزگارکردنی براکەی تریان کەسیان ئاویان نەخواردەوە، کەچی هەر چوار شەهید بوون و خوای گەورە بردنی بۆ ئەوەی لە بەهەشتدا بە ئاوی کەوسەری دەستی پێغەمبەری خۆشەویستی (درودو سڵاوی خوای لەسەر) تێراویان بکات!!

## قازی موسڵمانان زۆر بڵێ نابن

خەلیفەی پێنجەم و ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لێ بێ)، جارێکیان یەك لە (قازی)ییەکانی لەسەر کار لابرد، کابرای (قازی) زۆری بەلاوە سەیر بوو؟! هاتە خزمەتی و لێی پرسی:

- لەبەرچی منت لەسەر کار لابرد؟! خۆ من هیچ تاوانێکم نییە؟!

خەلیفە وەڵامی دایەوە:

- لەبەر ئەوەی خەبەریان پێ داوم، کە لە کاتی قەزاوەتکردنتدا، قسەی تۆ لە قسەی دوو کەسە ناکۆکەکان زۆرترە!! بەڵام قازی نابێ زۆر بڵێ بێ!!







## شاهێدی زانا و فەیلەسوفانی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام و موسڵمانان

### ١ـ ڕۆجییێ دوبا سکوییێ

نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی سویسرپییەو ژنەکەیشی هۆلەندییە، دوای خوێندنەوەی ئیسلام و لێ حاڵیبوونیان، هەردووکیان شایدی (لا اله الآ الله محمد رسول الله)یان داو موسڵمان بوون.

گرنگترین کتێبەکانی (ڕۆجییێ دوبا سکوییێ)، بریتینە لە (تەحەددی سەردەم) و(دەرکەوتنی ئیسلام) ، لەوەی دووەمینیدا دەڵێت: شایەتیدانی (لا إله إلا الله)، واتە خۆبەدەستەوەدان بۆ ویستی خوداو وەستان لە پێشیدا بە خشوعەوە، ئینجا هەنگاوی دووەم دێت: (محمد رسول الله)، ئەمەش واتە خۆبەدەستەوەدانی تەواو بۆ خودا، چونکە هیچ هۆکارێکی دیکە نییە، بۆ ڕەزامەندی خودا، جگە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر محەمەد (درودو سڵاوی خوای لەسەر).

ئاخەر پێغەمبەر محەمەد (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، بە نرخ دانانی تەواو بۆ دونیاو دواماییی ئەرکەکانی خۆی بەجێ هێنا، نمونەی باڵایشی پێشکەشکرد لە ئیمکانیەتی بەجێهێنانی حاڵەتی ئیمانی مرۆیی لەسەر زەوی، بەبێ ئەوەی بۆ تەنیا ساتێکیش لایەنی ڕۆحی فەرامۆش بکرێت! بە واتە هاوسەنگییەکی زۆر دڵگیری لە نێوان







دونیاو دوامایی درووستکرد، که ئەمە موسڵمانی پێ لە غەیرە موسڵمان جیادەبێتەوە، چونکە دەتوانێ چێژی تەواو لە دونیا ببات و لە هەمان کاتیشدا هەمیشە ئەوەی لە یادە، کە ئێمە هەموومان دەگەڕێینەوە لای خوداو لە پێشیدا دەوەستین!

بە ڕاستی: ئیسلام یارمەتی ئادەمیزاد دەدات، بۆ ئەوەی بە باشی بژیت و خۆی ون نەکات، چونکە دڵنیایی بۆ ڕۆح لەگەڵ ڕێکخستنی پەیوەندییە مرۆییەکان لەگەڵ یەك پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئەمەش هەمووی بۆ بەجێهێنانی ئەو ئامانجە پیرۆزەی خوای گەورە مرۆڤی بۆ خولقاندووە.

## ٢- لۆرد برینتۆن

مەسیحییەکی ئەوروپیی بوو، موسڵمان بوو و لە بارەی هۆی موسڵمانبوونی خۆی ڕایگەیاند:

- جیاوازی ئینجیلەکان وایانلێکردم بیّم لە قورئان بکۆڵمەوە، کە قورئانیشم خوێند دانایی و گوتاری فەصلم تیایدا بەدی کرد، ئەوەش ناچاری کردم موسڵمان ببم. کتێبی: (ربحت محمدا ولم أخسر المسيح).

## ٣- لۆرد ئیستانلی ئۆلدرلی

لەسەر دەستی عەبدوڵڵا کۆلیام موسڵمان بوو، لە بارەی موسڵمانبوونی خۆی گوتی: کتێبی خودای تەعالام کەوتە بەر دەست،







لە خوێندنەوەی نەبوومەوە، گریان باڵی بەسەردا کێشام، ئیتر دەروونی خۆم لە دەمارگیرییەکی کینەدار ڕزگار کرد و بوومە یەك لە موسڵمانان. کتێبی: (ربحت محمدا ولم أخسر المسيح).

## ٤ـ مارگرێت مارکۆس

مارگرێت مارکۆس ژنە نووسەرێکی بە بنەچە جولەکەی ئەمریکییە، پاش تەمەنێك لە جولەکایەتی و ڕەتکردنەوەی ئیسلام، ئیسلامی پیرۆز ئەو ژنە بۆ خۆی کێش دەکات و دەیخاتە ژێر کاریگەری جوانی و یاسا زێرینەکانی خۆی، ئیتر ئەو خاتوونە موسڵمان دەبێت و ناوی خۆی دەگۆڕێ، دەیکاتە: مریەم جەمیلە.

دوای ئەوە مریەم جەمیلە بە ژمارەیێك کتێب خزمەتی ئیسلام و موسڵمانان دەکات، لەوانە: (الإسلام في مواجهة الغرب) ، (رحلتي من الكفر إلى الإيمان) ، (الإسلام والتجدد) ، (الإسلام في النظرية والتطبيق).

لە هەندێ لە وتەکانیدا، ئەو خاتوونە دەڵێت:

١ـ (ئیسلام چارەسەری بۆ تەواوی پرسیار و کێشەکانم داناوە، ئەو پرسیارە سەرسوڕهێنەرانەی لە بارەی مردن و ژیان دەمکردن!! لەو بڕوایە دام، کە ئیسلام تاکە ڕێگەی گەیشتنە بە ڕاستگۆیی، ئەوەش سەرکەوتووترین چارەسەرە بۆ دەروونی مرۆڤەکان).





٢ـ (هەر لەو کاتەوە کە دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئان، تێگەیشتم، کە ئاین هەر تەنها بۆ ژیان پێویست نییە، بەڵکو ئاین هەر خۆی ژیانە، بۆیە هەرچەندەی قووڵتر دەبوومەوە لە لێکۆڵینەوە لە قورئان یەقینی زیاترم بۆ درووست دەبوو، کە ئیسلام ڕۆژێ لە ڕۆژان وای لە موسڵمانان کردووە، ببنە میللەتێکی شارستان و ڕابەرایەتی جیهان بکەن).

٣ـ (چۆن دەتوانی بگەیتە نێو قورئان تەنها لە ڕێگەی فەرموودەی پێغەمبەرەوە نەبێ، بۆیە ئەوەی بڕوای بە سوننەتی پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) نەبێ، بڕوای بە قورئانیش نییە)!

٤ـ (لەسەر ژنانی موسڵمان پێویستە ئەوە بزانن، کە ئەم دینە نیعمەتی خودایە بۆ ئەوان، چونکە ئەحکامەکانی ئەم دینە بۆ پاراستنی مافەکانی ئەوان هاتووە، کەرامەتیان پارێزراو دەکات و پارێزگاری لە پاکییان دەکات، نایەڵێت ئینتیهاکی حورمەتیان بکرێت و ناهێڵێت خێزانەکانیان لەباربچێت و لەبەریەکهەڵبووەشێنەوە).[٣]

---

٣ - کتێبی (ربحت محمدا ولم أخسر المسيح).. ئەویش لە: (مقدمات العلوم والمناهج)ی عەلامە ئەنوەر جوندی (مجلد٦/ ص١٩٩).



## ٥ـ عەلامەی دکتۆر عەبدولکەریم جەرمانۆس

زانایێکی مەجەڕییە، هەشت زمـانی وەکـو: عـەرەبی و فارسـی و تورکی و ئۆردی و ئەڵمانی و ئیتالی و ئینگلیزی و زمانەکەی خۆیشی مەجەڕی دەزانی.. ئەنـدام بـوو لـە کۆڕەکـانی زمـانی عـەرەبی لـە هەریەکە لە دیمەشق و قاهیرەو بەغداو ڕیبات، زیاتر لە سـەدو پـەنجا کتێبی بەو هەشت زمانانەی سـەروو دانـاوە.. لەوانـە: کتێبـەکانی: (معاني القرأن)، (شـوامخ الأدب العربـي)، (الله أكبر)، (بزووتنـەوە نوێکانی ئیسلام)، عەقاد وەهای وەصـفکردووە، کـە: عەبدولکـەریم جەرمانۆس دە زانایە لە یەك کەسدا.

**جەرمانۆس دەڵێت:**

١ـ ئیسلام لای من زۆر خۆشەویست بوو، چـونکە ئـاینی پاکییـە، پاکی دڵ و سلوکی کۆمـەڵایەتی و هەسـتی مرۆیـی، لـە ڕووی پـاکی لاشەییشەوە گاڵتەی پێ ناکرێ، چونکە ئەوە ڕەمزەو واتـای تایبـەتی خۆی هەیە.

٢ـ لە دڵی موسڵمانانەوە گەوهەرانێکم پێ بەخشراوە، بـەهادارترن لە زێڕ و زیو، بـەڵێ ئـەوان فێریـان کـردم هەسـتی خۆشەویسـتی و برایەتیکردنم تیا درووست بێ، کە ئەو گەوهەرانە بـە هـەموو زێـڕ و زیوی دونیا ناکڕدرێن!!



هەروەها فێریان کردم، کاری باش بکەم، فرمـان بـە چـاکە بکـەم، بەرگری بکەم لە خراپە! بۆیە لەسەر موسڵمانانە بە ددانەکانیان تونـد ئەم بەهایانە بگرن، کە بێجگەی خۆیان نییانە، بە پێچەوانەوە نەکەن بە بووقی ڕۆژئاوا هەڵخەڵەتێن، چونکە ئەوەی ڕۆژئاوا دەیڵێت، هـەر بە تەنیا قسەی لە خشتەبەری بێ ناوەڕۆکە.

٣- لە هەموو پڕەنسیپ و ڕێنماییـەکانی ئیسـلامدا یـەك وشـەش نییە ڕێگر بێت لە بەرەوپێشچوونی ئادەمیزاد، یان ڕێگەی لێ بگـرێ لەوەی بەشێکی زیاتر لە مەعریفەو سـامان و هێـز بـۆ خـۆی پەیـدا بکات، هیچ شتێکیش لە ڕێنمـایی و بڕیارەکـانی ئیسـلامدا نییـە، جێبەجێکردنی مەحاڵ بێت، چونکە ئیسلام موعجیزەییێکی گەورەیە، بەوە لە تەواوی ئاینـەکانی تـر جیادەبێتـەوە، بـەڵێ ئیسـلام ئـاینی ویژدانی ڕووناکەو بۆ لەمەولاش دەبێتە ئاینی تەواوی ئازادیخوازان!

## ٦- ڕۆبەر ولزلیی هونەرمەند

مەسیحییەکی ڕۆژئـاوایی بـوو، لـە پاشـان موسـڵمان بـوو، دوای موسڵمانبوونی خۆی، ڕۆبەر ولزلیی هونەرمەند بەم شـێوەیە هەسـتی خۆی دەربڕی: لە قووڵایی نـاخی خۆمـدا ئارامییـەك بـاڵی بەسـەردا کێشام، پێشتر هەستم بـە ئـارامی وەهـا نـەکردبوو، هـەر دەتگـوت گەیشتوومەتە سەر لوتکەی ژیان!! تەنانەت ئەو هەوایەش کە هـەڵی دەمژم، بە بۆنی خۆشی قەدەر بۆندار بووە!!











بەڵێ بەڕێزان:

دینی خودا بە قورئانەکەی دونیامانی بۆنخۆشکرد.. خۆ ئەگەر دین نەبووایە، لە دونیای تۆیا کەسم بەدی نەدەکرد؟! (ربحت محمدا ولم أخسر المسيح)

## ٧ـ (دکتۆر گرینییۆ)ی سیاسەتمەداری فەڕەنسی

ئەمە پیاوێکی مەسیحی و ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی فەڕەنسا بوو، دوای موسڵمانبوونی گوتی: لە هەموو ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزم کۆڵییەوە، کە بە زانستە پزیشکی و سوروشتییەکانەوە پەیوەنددارن، بینیم تەواو ڕێکن لەگەڵ مەعریفەو زانستی نوێی ئێمە، بۆیە موسڵمان بووم، چونکە یەقینم هات، کە موحەممەد هەقێکی ئاشکرای هێناوە، خۆ ئەگەر بێت و هەر خاوەن هونەرێکیش لە هونەرەکان، یان زانایێك لە زاناکان، بێن هەموو ئایەتە قورئانییە پەیوەنددارەکان بە هونەر، یان زانستەکەی خۆیان بە شێوەیێکی قووڵ بەرامبەر بکەن، وەکو ئەوەی من کردم، ئەوا بێگومان ئەگەر عاقڵ بن و چ نیازێکی خراپی پێشینەیان لە دڵدا نەبێت، یەکسەر موسڵمان دەبن.[٤]

---

٤ - (ربحت محمدا ولم أخسر المسيح).



## موسلمان دەبێ لەسەر ڕێگەی ڕاست بێ

گەنجێك دەهاتە مەجلیسی سوفیانی سەوڕی دادەنیشت، زۆر هێمن و بێدەنگ بوو، دیاربوو زۆر بە فیکراندا ڕوو دەچێت، بۆیە چ قسەی نەدەکرد و هەر بیسەر و ڕاماو بوو..

ڕۆژێکیان سوفیان ویستی بیجولێنێت و قسەیێکی پێ بکات، پێی گوت: ئەی لاو.. ئەوانەی لە پێش ئێمە بوون، بە سواری ئەسپە شێی خێراو سووك ڕێگەیان بڕی، بەڵام ئێمە بە سواری کەرە شەلەوە ڕێگە دەبڕین.

گەنجەکە وەڵامی سوفیانی سەوڕی دایەوەو پێی گوت: ئەی ئەبا عەبدوڵلا.. ئەوە گرنگ نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە لەسەر ڕێگەی ڕاست بین! چونکە ئەگەر لەسەر ڕێگای ڕاست بین، ئای کەوا زوو دەگەین!

مەبەست لە ڕێگەی ڕاست سیڕاتی موستەقیمە، کە سیڕات و ڕێگەی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و صالحینە.. ئەوەش گرنترین ڕێگاو خۆشەویسترین ڕێگایە لە لای خودا.













١ـ تەماشای زیادە جێبێڵە، خشوعت دەبێ.. قسەی زیادە جێبێڵە، حیکمەتت دەبێ.. خواردنی زیادە جێبێڵە، خواپەرستیت دەبێ!

٢ـ عەیبەی خەڵکی جێبێڵە، عەیبەی خۆتت بۆ دەردەکەوێ!

٣ـ لە خۆتەوە لە بارەی زاتی خوداوە مەدوێ، لە گومان و نیفاقدا ڕزگارت دەبێ!

٤ـ لە کاتی شکستدا پێبکەنەو لە کاتی سەرکەوتندا خاکی بەو سوپاسی خودا بکە!

٥ـ لە بیری بیروباوەڕەکەت بە، ژیانی ڕاستەقینەت دەستدەکەوێ.

٦ـ لاشەت ماندوو بکەو دڵت ماندوو مەکە!

٧ـ لە خودا بترسە ئەگەر کەمیش بێ! لە نێوان خۆت و حەرامدا پەرژینێك دابنێ، با تەنکیش بێ! لە خەڵوەت و تەنیاییشتدا خۆت لە گوناه و تاوان بپارێزە، چونکە یەکێك دەتبینێ، ئەو خۆی دادوەرەو دادگاییت دەکات!

٨ـ پیاوێکی ئیماندار هاتە سەر گۆڕێکی هەڵکەنراو، چاوی بە ئەلحەدەکەی کەوت، سەرنجی لەسەر کورتکردەوە، فرمێسك لە چاوی هاتە خوار و بە توندی گریا، لە پێشە خۆی گوتی: وەڵڵاهی تۆ ماڵی









ڕاستەقینەی منی، وەڵڵاهی ئەوەندەی لەمەولا بۆم بکرێ، هەر تۆ ئاوەداندەکەمەوە!

٩ـ خۆت لەوە دووربخەوە، بێی بەراوردی نێوان ژیانی خۆت و ژیانی کەسانێکی دیکە بکەیت، کە پێت وایە لە تۆ ئاسوودەترن!

١٠ـ نهێنیت لای تەنیا یەك کەس دابنێ و ڕاوێژت ببە لای هەزار کەس!

١١ـ لای تۆبەکاران دابنیشە، ئەوان لە هەموو کەس دڵنەرمترن!

١٢ـ جوانترین جوانییەکان جوانی ئیمان و زانستە!

١٣ـ جوانترین شتی ژیان: عەقڵێکی زیرەك، دڵێکی ئەمەکدار، خۆشەویستییەك لە پێناوی خودای گەورەو میهرەبانە!

١٤ـ نەزانترین کەس ئەوەیە دوامایی خۆی بە دونیای بفرۆشێت، لەویش خراپتر ئەوەیە دوامایی خۆی بە دونیای بێجگەی خۆی بفرۆشێ!

١٥ـ جوانترین وێنە وێنەی سەرکەوتنە! بەهێزترین وێنە، وێنەی ئازایەتییە! نزیکترین وێنە، وێنەی واقیعە! بەنرخترین وێنە وێنەی شەهیدە! ناسکترین وێنە وێنەی دڵسۆزییە! ڕوونترین وێنە وێنەی هەقیقەتە! دوورترین وێنە، وێنەی خەیاڵە!







١٦ــ ئەگــەر لەســەر هــەق بوویــت پێویســت ناکات،دەنگــت بەرزبکەیتەوە!

١٧ـ کەسێك جوێن بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەدات، بەڵام ئـەو هـەر هێنـدەی پێـدەڵێت: ئەگـەر قییامـەت نەبووایـە وەڵامـم دەدایەوە!

١٨ـ هەندێ کەس گەورەن، چونکە ئەوانەی دەوروبەری بچووکن!

١٩ـ دونیای فراوان سوودی چییە، ئەگەر پێڵاوەکانت تەنگ بن!

٢٠ـ گەنم کە لە ناوەڕاسـتی خۆیـدا دوو لەتـە، دەرسـی ئـەوەمان فێردەکات، کە خۆشییەکانت بکـە دوو بـەش، بەشـێکیان بـۆ تـۆ و بەشەکەی تر بۆ براکەت!

٢١ـ ئەو سەگەی لەسەر لاشەی شێرێك دەوەڕێ، ئەوە ئازا نییە!

٢٢ـ ئەوەی چ ڕایەکی نەبێت، سەری وەکـو دەسـکی دەرگـای لـێ دێ، ئەوەی بییەوێت، بۆ خۆی ڕادەکێشێت!

٢٣ـ صەحابەیێکی بەڕێز دەڵێت: هەر کەسێك کە وای پیشان دەدا شانازی بە شتێکەوە دەکات و بە هۆیەوەی لوتی لێبەرز دەکات، ئەوە لەبەر ئەوەیـە کەموکوڕییـەك لـە دەروونیـدا هەیـەو دەیـەوێت بـەو شانازییە ئەو کەموکوڕییەی بشارێتەوە.





٢٤- صەحابەییەکی بەڕێز دەڵێت: من خەڵکی ئەوماڵەم خۆش ناوێت، کە ڕزقی چەندین ڕۆژیان لە تاکە ڕۆژێکدا دەخۆن!

٢٥- لە دونیادا هیچ کەسێك نییە، بە شکستهێنان لە دایکبووبێ، بەڵام هەیە دەکەوێتە چاڵێك و هەر نایەوێت خۆی لێ دەربێنێ!

٢٦- یەك لە خواناسان دەڵێت: دوو موسیبەت لە دوای مردندا بەسەر ئادەمیزاددا دێن: یەکەمیان ئەوەیە ماڵ و سامانەکەی هەموو بۆ خەڵکی تر دەبێت.. دووەمیشیان ئەوەیە: لە بارەی هەموو ئەو پارەو سامانەی پرسیاری لێدەکرێت!

٢٧- لە کاتی خۆیدا مەهێڵە براکەت بکەوێ، باشترە لەوەی لە کاتی کەوتنیدا هەڵیسێنیتەوە!

٢٨- ئازارەکان خەڵکان یەکدەخەنەوە!

٢٩- ئەدەبی دڵ زۆر باشتر و بەسوودترە لە ئەدەبی زمان!

٣٠- زیاد لە پێویست بڕوا بەخۆبوون، مرۆڤ بەرەو تیاچوون دەبات!

٣١- بیر ڕەگ و ڕیشەی داهێنانە!

٣٢- شتێك هەیە بەهێزترە لە هەموو سوپاکانی جیهان، ئەویش ئەو بیرۆکەیە، کە لە کاتی خۆیدا بۆ مرۆڤ دێت!







٣٣- تەمەن تەنیا شتێکە، کە چەندەی زۆر بێت، کەم دەبێتەوە!

٣٤- بەهێز ئەوە نییە هەموو جارێ شەڕەکان بباتەوە، بەڵکو لاواز ئەوەیە، کە هەموو جارێ ئاشتییەکان دەدۆڕێنێ!

٣٥- پێکەنینت بە دەمی براکەت، تاکە وشەییێکی جوانە، کە چ پیتێکی نییە!

٣٦- هەمیشە بیر لە ونبووەکەت مەکەوە، مەبادا ئەوە واتلێبکات، ئەوەی هەشتە لە دەستت بچێ!

٣٧- ئەوەی زۆرتر لە خۆی ڕازی بێ، ئاسوودەیی کەمتر دەبێ!

٣٨- حەیاکردن لە ژندا جوانییەو لە پیاودا چاکی!

٣٩- ئەوەی درەختێکی خۆش بووێ، لقەکانیشی نابڕێتەوەو خۆشی دەوێن!

٤٠- نازناو تەنها ملوانکەیەکە بۆ بێئەقڵان، دەنا پیاوی ئاقڵ ناوی خۆی بەسە!



## له وته‌كانی صه‌حابی

### عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعود ( ڕه‌زای خوای لێ بێ )

١ـ ئه‌گه‌ر هه‌ر ناچارن ئیقتیدا به‌ یه‌كێك بكه‌ن، ئیقتیدا بــه‌ مــردو بكه‌ن، چونكه‌ زیندوو له‌ تێكه‌وتن به‌ دوور نییه‌.

٢ـ ئه‌گه‌ر گاڵته‌م به‌ سه‌گێك كرد، ده‌ترسم ببم به‌ سه‌گ.

٣ـ له‌سه‌ر پشتی زه‌ویدا هیچ شتێك بــه‌ قــه‌د زمــان پێویســتی بــه‌ به‌ندكردن نییه‌.

٤ـ زانست ئه‌وه‌ نییه‌ ڕیوایاتی زۆرت هه‌بێ، به‌ڵكو له‌خواترسییه‌!

### له‌ وته‌كانی خه‌لیفه‌ ئه‌بوبه‌كری صدیق ( ڕه‌زای خوای لێ بێ )

ـ مردن ئاسانتره‌ له‌وه‌ی پاشه‌خۆی و قورستره‌ له‌وه‌ی پێشه‌ خۆی.

ـ له‌ لایه‌ن خواوه‌ چاوانێك خراونه‌ته‌ سه‌رت و ده‌تبینن.

ـ خۆت چاك بكه‌ خه‌ڵكت بۆ چاك ده‌بێت.

ـ خودا هیچ نافیله‌یێك قه‌بوڵ ناكات، تا فه‌رزه‌كه‌ی ده‌كه‌یت.

ـ ئه‌و ترازووه‌ی هه‌قی ده‌خرێته‌ ناو، هه‌قی خۆیه‌تی قورس بێ، ئه‌و ترازووه‌ش ناهه‌قی ده‌خرێته‌ ناو، هه‌قی خۆیه‌تی سووك بێت.



## موسڵمانان خۆیان خۆشتر ناوێ

ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێ): لەگەڵ هەر یەکێك موجادەلەم کردبێ، حەزم کردووە خودا هەق لەسەر زاری ئەو زەقبکاتەوە، نەك لەسەر زاری من!

## موسڵمانان دوورە نیفاقن

محەمەدی کوڕی سەعیدی ئەنصاڕی لە ئەبولدەرداوە دەگێڕێتەوە، ئەو بەڕێزە گوتویەتی: پەنابگرن بە خوا لە خشوعی نیفاق..

پرسیویانە: باشە خشوعی نیفاق چییە؟!

وەڵامی داوەتەوە: خشوعی نیفاق ئەوەیە، خەڵك ببینێ لاشەت خاشیعە، بەڵام دڵت خاشیع نەبێ!!(٥)

## ژنانی موسڵمان لە مێردەکانیان کەمتر نین

ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی سێیەمی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێبێ)، حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فەهریی کردە سەرکردەی سوپایەك بۆ

---

٥ – صفة الصفوة، أبن الجوزي، ١/٢٣٩...







ئـاقڵکردنی ڕۆمییـەکان، چـونکە ئـەوان شـەڕیان بـە موسـڵمانان فرۆشتبوو و زیانیان پێگەیاندبوون، ژنەکەی (حەبیب)یش یەك بوو لە جەنگاوەرە موجاهیدەکانی ئەو سوپایە.

بەر لەوەی جەنگ دابمەزرێ، حەبیب بە نێـو ڕیزەکـانی سـوپاکەیدا هـات، بـۆ ئـەوەی مەعنـەویاتیان بەرزبکاتـەوەو یـادی خوایـان بیربێنێتەوە، کە هەموو سەرکەوتنێك تەنها لە خواوەو بە فەزڵی خـوا بۆ موسڵمانان تۆمار دەکرێت، ئا لەو کاتەدا چاوی کەوت بە ژنەکەی خۆی، ژنەکەی لێی پرسـی: ئـەی حـەبیب.. ئەگـەر شـەڕ دامـەزراو سوپاکان تێکەڵ بوون، دوای ئەوە من تۆ لە کوێدا دەبینمەوە!!

حەبیب وەڵامی دایەوە: یان لـە خەیمـەی سـەرکردەی ڕۆمییـەکان!! یانیش لە بەهەشت!!

واتە: بە پشتیوانی خودا، یان سەردەکەوم و یەکەم کەس دەچمە نێو خەیمەی سەرکردەی ڕۆمییەکان بۆ ئـەوەی سـەرکەوتنی موسـڵمانان و شکستی ڕۆمییـەکان ڕابگـەینم، یـانیش شـەهید دەبم و ئەوسـا لـە بەهەشت یەکتر دەبینینەوە!!

دوای ئەوە لێك جیابوونەوە، پاش ماوەیێك جەنگ دامەزرا، سوپای موسڵمانان زۆر ئازایانە جەنگان و خوای گەورە نیعمەتی سەرکەوتنی پێ بەخشین، حـەبیب وەکـو وادەی دابـوو، یەکسـەر بـەرەو خەیمـەی سەرکردەی ڕۆمییان چوو، بۆ ئەوەی کە ژنەکەی دێت، بێ وادەیی لێ












نەبینێ و لەوێدا بیبینێتەوە!! بەڵام کە گەیشتە خەیمەکەو چووە ناوی!! شتێکی سەیری دیت!! بەمە واقی وڕماو هیچی بۆ نەمایەوە، ئەوە نەبێ سوپاسی خوا بکات!!

بەڵێ!! حەبیب کە چووە ناو خەیمەکە، بینی ژنە ئازاکەی پێش ئەو چۆتە نێو خەیمەکەو لە نێو خەیمەکە چاوەڕوانی دەکات!!

## ژنانی موسڵمانان ئازان

جارێکیان خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ)، کە بینی خەریکە کچان مارەیی زۆر داوا دەکەن، بەوەش ئەرکی پیاوان قورس دەبێ و پرۆسەی ژنخوازی زەحمەت دەبێ، بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ ئەو بابەتە دابنێ و ژیان بە ئاسانی بمێنێتەوە، لە وتارێکیدا ئەمەی بە کارێکی ناڕەوا وەصف کرد و ڕێژەیێکی دیاریکرد، کە: نابێ کچان لەوەندە مارەییە زیاتر داوا بکەن!!

خەلیفە ئەم قسەیەی کرد، یەکسەر یەك لە ژنە ئازاکان لێی هەڵسایەوەو پێی گوت: تۆ مافی ئەوەت نییە ئەو یاسایە دەربکەی، چونکە خوای گەورە ئەو مەسەلەیەی بە کراوەیی جێهێشتووەو ژنانی ئازاد کردووە لەوەی ئەگەر هێندەی کێوێکیش داوا بکەن، پیاوان







پێیان بدەن و لێیان نەسێننەوە!! کە ئەمە دەقی ئایەت بە وردی ئاماژەی بۆ کردووە!!

خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ)، کە قسەی ئەم ژنە ئازایەی بیست، دڵی پێ خۆش بوو، کە ژنێکی گەنج بەو باشییە لە ئاینەکەی تێگەیشتووەو بەو جورئەتەوە بەرگری لەو مافە دەکات، کە خودا بەم و بە کچانی هاوشێوەی داوە!!

بۆیە لە بڕیارەکەی خۆی پەشیمان بووەوەو گوتی: ژنێك ڕاستی کرد و عومەر هەڵەی کرد!!

## موسڵمانان چاکەکار و بە عیززەتن

حەسەنی بەننا، بە هاوڕێکانی گوت:

١ـ کاتێك ئێمەی موسڵمان لە سوجدەدا سەری بەرزمان بۆ خودا نزم دەکەینەوەو لەسەر زەویی دادەنێین، مانای وایە لە بەرامبەر غەیری خوا بە بەرزی دەیهێڵینەوەو قەت بۆ کەسی دانانەوێنین!

٢ـ لەگەڵ خەڵکیدا وەکو درەخت وا بن، خەڵك بەردی تێدەگرن، ئەویش بەری شیرین و خۆشیان تێدەگرێت!









## موسڵمان هاوسێی باشن

موسڵمانان دەڵێن: تۆ بەوە نابییە هاوسێیەکی باش بۆ هاوسێکەت، ئەگەر بێت و زیانت بۆی نەبێ، بەڵکو بەوە دەبیە هاوسێی باش بۆ هاوسێیەکەت، ئەگەر لە بەرامبەر خراپییەکانی ئەو، تۆ بەرگە بگریت و هەر بە باشی بمێنیتەوە.

## موسڵمان بەتەنیا خودای بەسە

عوسمانی کوڕی مەزعون (ڕەزای خوای لێبێ)، لە پەنای (وەلیدی کوڕی موغەیرە) بوو، وەلیدیش یەك لە سەرۆکە گەورەکانی قورەیش بوو، بۆیە وەزعی باش بوو و هیچ یەکێ لە بتپەرستانی قورەیش شەڕی پێنەدەفرۆشت و بە شێوەیەك لە شێوەکان زیانی پێ نەدەگەیاند!! بەمە سەر و ماڵی پارێزراو بوو!!

بەڵام موسڵمانانی تر، لە دەست زوڵم و ستەمی قورەیشی بتپەرست ڕزگاریان نەدەبوو، قورەیشی کافر ئەو موسڵمانانەیان بە خراپترین شێوە دەچەوساندەوەو ئازاریان پێ دەگەیاندن!! عوسمانیش ئەوەی بە چاوەکانی خۆی دەدیت!! دەیبینی خوشك و برا موسڵمانەکانی لەسەر دینەکەی خۆیان، بە دەستی بتپەرستانەوە چەندە ئازار دەدرێن؟! چەند دەچەوسێنرێنەوەو ستەمیان لێ












دەکرێت؟! بۆیە خۆی پێ نەگیرا، هاواری کرد و گوتی: (وەڵڵاهـی لـە ناوەوەی خۆمدا، هەست دەکەم هات و چوونی من بە ئارامی لە پاڵ پیاوێکی موشریکدا لەو کاتـەدا کـە کـەس و کـار و هاورێکـانم لـە پێناوی خوادا بەڵاو ئازاری جۆراوجۆری وەهایان ڕووبەڕوو دەکرێتەوە، کە ئەو بەڵاو ئازارانە ڕووبـەڕووی مـن ناکرێنـەوە، کەموکوڕییـەکی گەورەیە بۆ من)!

خۆشەویستی عوسمانی سەحابە بۆ خوشك و بـرا ئیمانییـەکانی، وای لـێ دەکـات، نەیـەوێ خـۆی لـە ئـارامی و ئاسایشـدا بـژی و بـراو هاوئاینەکانی لەژێر ئازاری موشریکان بن و بە دەستیانەوە بنـاڵێنن، لە ڕاستیدا ئەمە بە هۆی ئیمانی بـەهێزەوە درووسـت دەبێـت، بۆیـە بەشنەبوونی خۆی لەو ئـازارەی ئـەوان ڕووبـەڕوویان دەکرێتـەوە، بـە کەموکوڕی دەزانێـت! بۆیـە ئـەم پەنادانـەی ڕەتکـردەوە، هاتـە لای وەلیدی کوڕی موغەیرەو پێی گوت: ئەی ئەبا عەبدی شـەمس.. تـۆ پەیمانەکەی خۆت گەیانـدە سـەر، ئێسـتاش مـن پەنادانەکـەمت بـۆ دەگێڕمەوە.

وەلیـد پێـی گـوت: بـرازای خـۆم لەبەرچـی؟! ئایـا کەسـێکی قەومەکەی من تۆیان ئازار داوە؟!

عوسمـان (ڕەزای خـوای لـێبێ) وەڵامـی دایـەوە، پێـی گـوت: وەڵڵاهی وا هەست دەکەم من ناتوانم بە پەنای کـەس ڕازی بم، جگـە







له پەنای خودا، بۆیە ناشمەوێ لە غەیری خودا، خۆم پەنای کەسی دیکە بدەم.

وەلید پێی گوت: باشە.. کەوابێ بڕۆ مزگەوت بە ئاشکرا پەنادانەکەی من ڕەتبکەوە، وەکو چۆن بە ئاشکرا پەنادانی منت قەبوڵ کردبوو.

عوسمان گوتی: باشە.. ئیدی لەگەڵ (وەلید) چوونە مزگەوتی کەعبەی پیرۆز، لەوێ وەلید گوتی: خەڵکینە ئەوە عوسمانە، هاتووە پەنادانی من ڕەتبکاتەوە.

عوسمان گوتی: من وەلیدم بە پیاوێکی باش و باش پارێزگار لە خۆم بینی، بەڵام حەزم کرد، بە غەیری خودا، خۆم پەنای کەس نەدەم، بۆیە پەنادانەکەی وەلید ڕەتدەکەمەوە.

دەبینین موسڵمانان چەندە دڵپاك و بەوەفان، عوسمان پێی قەبوڵ نەکرا خودا هەبێ و ئەو بچێ خۆی پەنای کەسێکی بتپەرست بدات!! ئەوەشی پێ قەبوڵ نەکرا، خوشك و برا موسڵمانەکانی لە لایەن بتپەرستانەوە ئازاربدرێن و یچەوسێنرێنەوە، کەچی ئەو لە پەنای بتپەرستێکدا ئارام و ئاسوودە بژی و خەمی خوشك و براکانی نەبێ؟!

عوسمان ئەوەی بەلاوە ناحاڵیبوون بوو لە ئیسلامی پیرۆز، بۆیە پەنای وەلیدی ڕەتکردەوەو خۆی دایە پەنای خوای گەورە.











دەگێڕنەوە: هەر ئەو کاتەی عوسمان پەنادانی وەلیدی ڕەتکردەوە، یەك لە بتپەرستەکان لە عوسمان هاتە پێش، شیشێکی لە چاوی چەقاند و چاوێکی عوسمانی ڕژاند!! وەلید ئەمەی پێ ناخۆش بوو، بە عوسمانی گوت: برازای خۆم.. تۆ لە پەنای کەسێکی بەهێز دابووی و هەق نەبوو وەها بکەی، پەنای من ڕەتبکەیەوەو بەو شێوەیە بە بەرچاوی منەوە یەکێك بێت چاوێکت بڕێژێ؟!

عوسمان گوتی: وەڵلا چاوە ساغەکەم خۆزگە بە چاوە ڕژاوەکەم دەخوازێ و حەز دەکات وەکو ئەو لە پێناوی خوادا ببێتە قوربانی!! منیش لە پەنای یەکێکم، لە تۆ بە تواناتر و بەهێزتر و دەسەڵاتدارترە ئەی ئەبا عەبدی شەمس.

عوسمان (ڕەزای خوای لێبێ)، بەم قسەیەی بتپەرستانی تووشی شۆك و بێئومێدی کرد و بۆ خۆی و بۆ مێژووی ئیسلام و موسڵمانانیش گەورەترین تابلۆی خۆشەویستی و سۆزی موسڵمانان بۆ یەکتریی تۆمار کرد.

## موسڵمانان هەقخوازن

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز منداڵێکی دە دوانزەساڵی بووە ئەوکاتەماڵیان لە میسر بوو، چونکە (عەبدولعەزیز)ی باوکی والی میسر و ئەفریقیا بوو، ڕۆژێکیان چووە ناو تەویلەی ئەسپە جوانەکانیان، یەکێ لە ئەسپەکان شاڵاوی بۆ هێنا، خستیە ژێر









قاچەکانی و زامداری کرد، ئیتر زیراندی و پیاوەکانیان هاتن هەڵیانگرتەوە، بردیانەوە ماڵ، دایکی کە بەم شێوەیەی بینی!! زۆر تێکچوو، سەرۆکی پاسەوانەکانیشیان زۆر توڕەبوو، بڕیاری دا پاسەوانی تەویلەو ژنەکەیشی بکوژێ، یان ئازارێکی زۆریان بدات، چونکە بێ ئاگابوونە لەوەی ئەو منداڵە چۆتە ناو تەویلەو وەهای بەسەر هاتووە، پاسەوانەکە گریاو گوتی: من تاوانم نەبووە! ئەو خۆی ڕۆشتووە، منی ئاگادار نەکردۆتەوە!

بەڵام ئەم قسانەی نەیخواردو سەرۆکی پۆلیس هەر هەرەشەی لێ دەکرد، هەتا (عومەر) بەمەی زانی، ئەوسا یەکسەر ڕووی کردە بەرپسی پۆلیسەکان و پێی گوت: لەو مەسەلەیەدا کەس تاوانبار نییە، من خۆم پرسی کەسم نەکردووەو چوومەتە ئەو شوێنە، بۆیە کەس ئەزیەت نەدەن!!

نەك هەر ئەوەش، بەڵکو لەبەر ئەو ئازارەی پاسەوان و ژنەکەی، کە سەرۆکی پۆلیس بە قسە ترساندبوونی و نارەحەتی کردبوون، عومەر بە دایکی گوت: تۆڵە بۆ ئەو ژن و پیاوە هەژارە بکەنەوە..

ئیتر دایکی عومەر کیسەیەك پارەی بۆ ئەو ژن و پیاوە هەژارە ناردو فرمانی بە سەرۆکی پۆلیس کرد، ڕزگاریان بکات، چونکە عومەر قەبوڵ ناکات لەسەر ئەو مەسەلەیە، خەڵکی بێ تاوان سزا بدرێت!!







ژنی پاسەوان کە کیسە پارەی دەستکەوت، ئەو پارە زۆرەی کە لە ژیانی خۆیدا هەژارەی خەوی پێ نەدیتبوو، هێندە دڵخۆشبوو، چاکەی ئەو منداڵ و ماڵەی زیاتر بۆ دەرکەوت، لە پێش چاوی گەورەتر بوون و بە مێردەکەی گوت: باشە بۆ لێنەدەگەڕای لە زووەوە ئەسپ پەلاماری بدەن!! خۆ ئەو پارەیان زووتر دەدایێ!!

## وتەی موسڵمانە ئاقڵەکان

١- خەندەیەك بە ڕووی براکەتدا هیچێکت لەسەر ناوەستێنێت، بەڵام مانای زۆر دەگەیێنێت، لە فەرموودەشدا هاتووە، پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) فەرموویەتی: خەندەت بە ڕووی براکەتدا صەدەقەیە.

٢- فەرهەنگی سەرکەوتن ئەم دوو وشانەی تێدا نییە: (ئەگەر) و (بەڵام).

٣- مرۆڤە فەشەلەکان لە ژیاندا دوو دەستەن، دەستەیەکیان بیردەکاتەوە، بەلام هیچ کردوەیەکی نییە.. دەستەی دووەمیش کاردەکات بەڵام قەت بیرناکاتەوە.. بەڵام مرۆڤی سەرکەوتوو ئەوەیە: بیردەکاتەوەو کاریش بە پێی بیرکردنەوەو قەناعەتەکانی خۆی دەکات!









٤ـ ئەو کەسەی شتێك نەدۆزیتەوە لە پێناوی بمریت؟! بێگومان شتێکیشی نەدۆزیتەوە لە پێناوی بژیت!! دەی لە (خوای گەورە) باشتر چییە، خەڵك لە پێناویدا بژی و بمریٚ؟!

٥ـ با هەموومان خوداناس بین، چونکە بە هۆیەوەی ئاسوودەیی و سەربەرزی دونیاو دوامییمان دەست دەکەویت.

## موسڵمانان لە پۆستەکان گەورەترن

عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: ڕۆژێکیان لە خزمەت باوکم دابووم، خەڵکێك لە کەرخییەکان هاتنە لای باوکم، هاتنە سەر خەلافەتی عەلی و زۆریان درێژکردەوە، کە عەلی لە سەردەمی خەلیفایەتی وەها بوو و وەها بوو!!

باوکم سەری بەرزکردەوەو پێی گوتن: کورە خەڵکینە ئێوە زۆرتان باس لە خەلیفایەتی عەلی کرد!! ئەوە پێتان وایە عەلی بە هۆی خەلیفایەتییەوە جوان بووە؟! نەخێر مەسەلەکە وا نییە، ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە: بە هۆی عەلییەوە خەلافەت جوان بوو!!









## موسڵمانان ڕوو لە خوا پشت لە دونیان



عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەر لەوەی ببتە خەلیفە، زۆر دەوڵەمەند بوو، باشترین خواردنی دەخوارد و جوانترین و نایابترین جلیشی لەبەر دەکرد، بەڵام کە بووە خەلیفەی موسڵمانان، وازی لە هەموو ئەو جل و خواردنانەی هێنا، چی سادەیە ئەوەی دەخوارد و چی هەرزانە ئەوەی لەبەر دەکرد!!

بۆیە مالیکی کوڕی دینار دەیگوت: خەڵکی بە من دەڵێن: تۆ زاهیدی.. بەڵام لە ڕاستیدا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز زاهیدە، ئاخەر ئەو دونیای بۆ هاتە بن دەست و ڕووی لێ وەرگێڕا..!!

کاتێك هەواڵی کۆچی دواییشی کەوتە بەر گوێی ئیمبڕاتۆری ڕۆم، ئەو پیاوەی دوژمنێکی سەرسەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، گریانێکی زۆر بەکوڵ گریا، دەوروبەرەکەی خۆی هەموو سەرسام کرد؟! ئاخەر ئیمبراتۆر چۆن دەبێ بە بیستنی هەواڵی خەلیفەی موسڵمانان بگری؟! بە پێچەوانەوە دەبێ بەم هەواڵە دڵخۆش بێ و شیرینی دابەش بکات؟! ئەدی لە موسڵمانان بەولاوە، دەوڵەتی ڕۆم چ دوژمنێکی دیکەی هەیە؟!

بەڵام ڕای ئیمبراتۆر وانەبوو، ئیمبراتۆر پاش ماوەیەك گریان، دەستێکی بە چاویدا هێنا، فرمێسکەکانی سڕی و گوتی: وەڵڵاهی پیاوە دادگەرەکە مرد!! لە دادگەریدا نموونەی نەبوو؟! ئاخەر هیچ







سەیرییەکی تیا نییە، بە پیاوێکی ڕاهیب، ـ کە نێو خەڵکی جێهێشتووەو چووە لە سەومەعەکەی خۆی لە دووری خەڵکی خواپەرستی دەکات، بڵێن: وازی لە دونیا هێناوەو پیاوێکی چاکە؟! بەڵام سەیری لەو پیاوەیە، کە خەلیفەی موسڵمانانە، دونیای بە تەواوی کەوتە بەر دەست، چی خۆشییە کەوتە ژێر قاچەکانی، ئینجاش پشتی تێکرد و خاکییانە ژیا!!

## موسڵمانان نەتەوەیەکی ژیارین

یەك لە والییەکانی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، نامەیەکی بۆ نووسی، لەو نامەیەدا داوای پارەیەکی زۆری کرد، بۆ ئەوەی شورایەکی بڵند و بەهێز لە دەوری پایتەختەکەی خۆی درووست بکات.

خەلیفە سەیری بەو نامەیە هات؟! لە وەڵامدا بۆ ئەو والییەی نووسی:

- شورای بڵند و بەهێز نرخی چییە؟! ئەگەر دادگر نەبی؟! بڕۆ بۆ ئەوەی پایتەختەکەت بپارێزی، دادگربەو بە هیچ شێوەیەك زوڵم و ستەم مەکە!!






## خەلیفەی موسڵمانان لەخواترسە

دەگێڕنەوە: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، لەگەڵ خەلیفە سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك پێکەوە لە سەفەرێك بوون، لە پڕێکدا ئاسمان بووە هەورە تریشقە، دونیا تاریك بوو و بارانێکی بە تاو باری، بەمە خەلیفە سولەیمان زۆر ترسا، نەیدەزانی پەنایەك لە کوێ بدۆزێتەوە، بچێتە ژێری؟! کەچی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پێدەکەنی؟! خەلیفە سولەیمان بەوە توڕە بوو، بە عومەری گوت: ئەوە تۆ بە چی پێدەکەنی عومەر؟! نابینی لە چ بارێکی ناخۆش داین؟!

عومەر وەڵامی دایەوە: ئەوە شوێنەواری ڕەحمەتی خوایە بەسەرمانەوە برام، ئینجا ئەوها سەختەو نازانین چۆن خۆی لێ ڕزگار بکەین!! دەڵێم: ئەدی دەبێ شوێنەواری غەزەب و توڕەیی خودا چۆن بێ؟!

## موسڵمانان هەر نمونەن

حەسەنی وەراق دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە ئەبا عوسمانم پرسی هاوڕێیەتی باش چۆنە؟ وەڵامی دامەوە: کەسی باش لەگەڵ خودای خۆی بە ئەدەبە.. لەگەڵ پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) زانستخوازەو پەیڕەوی لە سوننەتەکانی دەکات.. لەگەڵ وەلییەکانی خوداش بەڕێزەو لە خزمەتیان دایە!! لەگەڵ برا







نیمانییەکانیشی دەم بە خەندەو دڵ گەورەیە، لاساری لەگەڵ کەسیان ناکات، مەگەر شتێکی پێچەوانەی دین و شەریعەتیان لێ ببینێ!! لەگەڵ خەڵکی نەزان بەسۆزەو بە چاوی ڕەحم و بەزەیی تەماشایان دەکات!! بۆ خۆیشی سوپاسی خودا دەکات، کە ڕەحمی پێکردووەو وەکو ئەوان بە نەزانی نەهێشتۆتەوە، دوعاش لە خودا دەکات، کە بۆ هەمیشە لە بەڵای نەزانی دووری بخاتەوە.

## موسڵمانان بە خواناسی دەییەنەوە

لە (زەیلی تەبەقاتی ئەلحەنابیلە)دا ئیبن و ڕەجەب باسی ژیاننامەی قازی ئەبی بەکری ئەنصارِی بەزازی نووسیوە، یەك لە بەسەرهاتەکانی ئەو قازییە بەڕێزەی بەم شێوەیە گێڕاوەتەوە:

قازی ئەبی بەکر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: ماوەیەك لە مەککە نیشتەجێ بووم، ڕۆژێکیان تووشی برسییەتییەکی زۆر هاتم، لە ماڵ هاتمە دەر، بە دوای پارووە نانێك، دەنکانێ خورمایێك بووم، بۆ ئەوەی ئەو برسییەتیەی خۆمی پێ بە کۆتا بێنم، بەڵام دەستم نەکەوتن!! بەڵام کیسەیەکی لە ئاوریشم دروستکراوم دۆزییەوە، بە پەڕۆیێك توند بەسترابووەوە، منیش هەڵمگرت و هێنامەوە ماڵ، لەوێ کردمەوە، بینیم ملوانکەیەکی لە دووڕ دروستکراوی تیایە، پێشتر قەت شتی وەهام نەدیبوو!! پاشان کیسەکەم وەکو خۆی



گرێدایەوەو هاتمەوە دەر، بەڵکو خواردنێکم دەست بکـەوێت، چونکە برسییەتییەکەم هەر زیادی دەکرد، ئەمجارەیان لە دەرەوە پیرەمێردێکم دیت، بانگی دەکرد: کێ کیسەیەکی وەهاو وەهای دۆزیوەتەوە، بۆمی بێنێتەوە، پێنجسەد دیناری زێڕی پێ دەدەم!!

لە دڵـی خۆمـدا گـوتم: مـن زۆر پێویسـت و برسـیم، بـا ئـەو پێنجسەد دینارەی وەربگرم و کیسەکەی بدەمەوە خاوەنەکەی!! بۆیـە لە پیرەمێرد چوومە پێش، پێم گـوت: لەگـەڵ مـن وەرە.. پیرەمێـرد بەگەڵم کەوت و بردمەوە ماڵ، لەوێ پرسیارم لە بارەی کیسەکەوە لێ کرد، گوتم: ناونیشانەکەیم بۆ هەڵبدە، کیسەیەکی چۆنەو چی تیایە؟!

پیرەمێرد چۆن بوو، وەهای وەسفی کیسەکەو ملوانکەکەی نـاوی و ژمارەی ئەو دووڕانـەی لێـی درووسـتکراوەو هـەموو ئەوانـەی بـە تەواوەتی بۆ هەڵدام.. منیش کیسەکەم دەرهێناو پێم دایەوە، ئەویش پێنجسەد دینارەکەی پێدام، وەکو وەعدی دابوو و هەستا ڕۆیشت!!

## خەلیفەی موسڵمانان هەژارانیان خۆش دەوێ

خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوڕی خـەتاب، کـە زانـی بـاری بژێوی فاتیحی گەورەو ئـەمینی ئوممـەتی ئیسـلامی ئەباعوبەیـدەی جەڕاح (ڕەزای خوایان لێبێ) خراپە!! چوار سەد دیناری بـۆ هـەنارد، بۆ ئەوەی تۆزێ ژیانی خۆی بەو برە پارەیە ئاسانتر بکات!!









کەچی کە پارەکە گەیشتە دەستی ئەبا عوبەیدە، هێشتا نێردراوەکەی خەلیفە لە لای ئەبا عوبەیدە نەڕۆیشتبوو، ئەبا عوبەیدە پارەکەی هەموو بەسەر هەژاراندا دابەش کرد، بۆیە کە گەڕایەوە مەدینە، ئەو هەواڵەی گەیاندەوە خەلیفە.. خەلیفە گوتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی وایکرد لە ئوممەتی ئیسلامدا خەڵکێك هەبێ وەها بکەن!!

## موسڵمانی باش لە ڕابردووشدا هەر باشە

عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێبێ)، لە سەردەمی جاهیلیشدا، کە هێشتا ﴿خوای گەورە﴾ (سوبحانەهو وەتەعالا) بە هۆی قورئانی پیرۆزی خۆی سەرزەوی پاکنەکردبۆوە، باشترین کەسی هۆزەکەی خۆی بوو، ڕەچەڵەك و بنەماڵەکەی زۆر چاك بوون!! زۆر دەوڵەمەند بوو!! زۆر بە حەیا بوو!! قسەی زۆر شیرین و خۆش بوو!! بۆیە قەومەکەی زۆریان خۆش دەویست، دایك بە منداڵەکەی دەگوت:

أحبك والرحمن

حب قريش لعثمان

واتە: خۆشتم دەوێ بە خوا گیان

وەك هی قوڕەیش بۆ عوسمان





جگە لەمانە هەمووی:

عوسمان قەت سوجدەی بۆ بتێك نەبردبوو!!

قەت فاحیشەیەکی نەکردبوو!!

قەت عەرەقی نەخواردبوو، دەیگوت: ئەم عەرەقە عەقڵ دەبات و عەقڵیش بەرزترین شتێکە خودا دابیتیە عەبدی خۆی، بۆیە عەبد دەبێ بەو عەقڵەی بەرزبێتەوە، نەوەك ململانێی لەگەڵ بکات!!

## موسڵمانان گومانیان باشە

ئەبی زەرعەی ڕازی دەگێڕێتەوە، دەڵێت: پیاوێك پێی گوتم: من ڕقم لە معاوییەیە.

گوتم: لەبەرچی؟!

گوتی: لەبەرئەوەی شەڕی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالب کرد.

گوتم: کورە ئەوە تۆ چ دەڵێی؟! هەی قوڕبەسەر!! پەروەردگاری معاویە ڕەحیمەو دوژمنی معاویەش، کە عەلییە، کەسێکی چاك و کەریمە، ئیدی تۆ بۆ خۆت دەخەیە ئەم نێوانە؟! چ هەقت هەیە بەسەریانەوە؟!





## موسڵمانان هەرچی دەیکەن لە پێناوی خودایە

ئیمامی غەزالی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوایان لێبێ)، دەیگوت: ((وەڵڵاهی ئەگەر بێت و ماڵ و سامانەکەی خۆم هەر هەمووی لە پێناوی ئەڵڵا بەخشی، لە پاشان هەموو ڕۆژەکان بەڕۆژوو بووم و قەت ڕۆژێ بێ ڕۆژوو نەبووم، بە درێژایی هەموو شەوەکانیش شەو نوێژم کرد و قەت شەوێ لە شەونوێژ دوانەکەوتم، بەڵام کە گەڕامەوە بۆ لیقای خودا، لە پێناوی خودا خوداناسان و صالحانم خۆشنەویستبێ و لە پێناوی خودا ڕقم لەوانە نەبووبێتەوە، کە لە خودا عاصین، دەترسم خوای گەورە بەسەر چاوەکانما بەرمداتەوە نێو دۆزەخ))..

واتە: ئەوە چ موسڵمانێتییەکە، کەسی موسڵمان لە پێناوی خوا موسڵمانانی خۆش نەوێت و لە پێناوی خوا ڕقی لە عاصی و کافران نەبێتەوە؟!

## موسڵمانان وەکو خۆیان بۆ یەکتر دەوێ

عەبدوڵڵای خوشکەزای موسلیمی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ساڵێکیان دەچوومە حەجی ماڵی خوا، موسلیمی خاڵۆم دە هەزار درهەمی پێدام، گوتی: کە چوویتە مەدینەی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، بە دوای هەژارترین ماڵی ئەوێ بگەڕێ و ئەو پارەیە بدە ئەوان.



منیش پارەکەم وەرگرت و چوومە سەفەرەکەم، کە گەیشتمە مەدینە، چوومە نێو خەڵکی و پرسیاری ماڵی هەژارترین خەڵکی ئەو شارەم کرد، گوتیان: هەژارترین کەسی ئەو شارە ماڵی لە فلانە شوێنیە..

ئیدی منیان برد، ماڵەکەیان پێ نیشان دام، منیش چووم لە دەرگام دا، لە ژوورەوە ژنی ماڵەکە وەڵامی دایەوە، گوتی: کێیە؟

گوتم: من پیاوێکم خەڵکی شاری بەغدامە، موسڵمانێك دە هەزار درهەمی بە مندا هەناردووەو گوتوویەتی، کە چوویتە مەدینە، ئەو پارەیە بدە هەژارترین ماڵی مەدینە، منیش کە هاتمە ئێرەو پرسیاری هەژارترین ماڵی ئەو شارەم کرد، موسڵمانان ماڵی ئێوەیان نیشان دام، بۆیە من پارەکەم بۆ ئێوە هێناوە، با یەکێکتان بێتە دەر، ئەو پارەیەی پێ بدەم.

ژنە گوتی: نەخێر برا.. ئەو ماڵەی تەنیشتمان لە ئێمە هەژارترن، بڕۆ بیدە ئەوان.

منیش ناچار چوومە ماڵەکەی تەنیشتیان، لەوێش لە دەرگام داو دیسانەوە لە ژوورەوە ژنی ئەو ماڵەش وەڵامی دایەوە، گوتی: کێیە؟












گوتم: من پیاوێکم خەڵکی شاری بەغدامە، موسڵمانێك دە هەزار درهەمی بە مندا هەناردووەو گوتوویەتی، کە چوویتە مەدینە، ئەو پارەیە بدە هەژارترین ماڵی مەدینە، منیش کە هاتمە ئێرەو پرسیاری هەژارترین ماڵی ئەو شارەم کرد، موسڵمانان ماڵی ئێوەیان نیشان دام، بۆیە من پارەکەم بۆ ئێوە هێناوە، با یەکێکتان بێتە دەر، ئەو پارەیەی پێ بدەم.

ژنی ئەو ماڵەش گوتی: نەخێر برا.. ئێمەو ئەو ماڵەی تەنیشتمان هەردووکمان وەکو یەك هەژارین، پارەکە بکە دوو بەش و هەر بەشەی بدە یەکێکمان.

## موسڵمانان ئەرك و مافی خۆیان دەزانن

لە سەردەمی خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێ)، ماوەییێکی باش عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) قازی شاری مەدینە بوو، بەڵام پاش ئەو ماوەیە هاتە لای خەلیفەو داوای لێکرد، لە پۆستەکەی عەفوی بکات!

خەلیفە سەیری پێ هات؟! پرسی: چییە؟! گەلێ ماندووی بۆیە داوای ئیعفاو دەست لەکارکێشانەوە دەکەیت؟!







عومەر وەڵامی دایەوە: نەخێر.. لەبەر بێئیشی داوای دەست لە کارکێشانەوە دەکەم، چونکە بە درێژایی ئەو ماوەیە تەنیا یەك کەسیش کێشەیەکی نەبووە بیهێنێتە دادگا؟!

خەلیفە پرسی: بە ڕای تۆ لەبەرچی؟! ئایا کێشە هەر نییە؟!

عومەر گوتی: لەبەرئەوەی ئەوانە خەڵکێکی ئیماندارن، هەموو یەکێکیان هەقی خۆی دەزانێ، ئیتر زیاتر داوا ناکات!! ئەرکی خۆیشی دەزانێ، ئیتر کەمتەرخەمی ناکات!! هەموو یەکێکیان ئەوەی بۆ خۆیان خۆشیان دەوێ، بۆ براکەشیان ئەیانەوێ!! ئەگەر یەکێکیان ون بن، دەپرسن؟! ئەگەر یەکێکیشیان نەخۆش بوو، دەچن سەردانی دەکەن!! ئەگەر یەکیان پێویست بوو، یارمەتی دەدەن!! ئەگەر یەکیان هەژار بوو، کۆمەکی دەکەن!! ئەگەریش یەکیان نەخۆش بوو، دوعای بۆ دەکەن!! دینیان ئامۆژگاری کردنی یەکە!! ڕەوشتیان فەرمان بە چاکە و نەهیکردنە لە خراپە!! ئیتر لەبەرچی ناکۆکی بکەوێتە نێوانیان؟!

بە ڕاستی ئەو کۆمەڵگایە کۆمەڵگای لوتکە بووە!! ئاخەر ئەگەر ئەو سیفەتانەی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە بارەی خەڵکی ئەو کۆمەڵگای لوتکەیە دەیانژمێرێ، لە هەر کۆمەڵگایێکدا هەبێ؟! ئایا ئەویش نابێتەوە کۆمەڵگای لوتکە؟! ئایا ئەو هەموو کێشەو ناکۆکییەی هەیەو ئەو هەموو کوشت و بڕییەی











لێرەو لەوێ ڕوودەدەن، هیچیان دەمێنن؟! ئەدی بۆچی خەڵك بەو پەروەردە جوانە پەروەردە نەکرێت؟! ئایا ببینەوە کۆمەڵگایێکی سەرکەوتوو و پێشکەوتووی پڕ ئەمن و ئەمان و خۆشەویستی و لە لوتکەی ژیار و شارستانیەت، ئەوە بە ڕاستی خۆزگەی هەموومان نییە؟! ئەدی ئەگەر خۆزگەی هەموومانە ئەو کەمتەرخەمییە بۆ و ئەو لاساییکردنەوەی پرۆگرامەکانی دیکە بۆ؟!

## موسڵمانان لە ژنەکانیان دەبوورن!

پیاوێك هاتە لای ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ)، بۆ ئەوەی شکایەت لە خراپی ژنەکەی بکات، بەڵام کە لە لای ئەمیری ئیمانداران دانیشت، بینی ئەویش لە لایەن ژنەکەی ئازار دراوەو ژنەکەی بەسەریدا هاوار دەکات؟! کەچی هیچ ناڵێت و خۆی بێدەنگ کردووە؟! بۆیە کابرا بە هێمنی هەڵساو هیچی نەگوت!!

ئەمیری ئیمانداران بانگی کرد: ئەرێ برا تۆ کارێکت نەبوو؟! چۆن وەها هاتی و چۆن وەها بە زوویی ڕۆشتی؟!







کابرا گوتی: وەڵڵاهی ئەی ئەمیری ئیمانداران من لە دەست ژنەکەمەوە وەڕس بووبووم و هاتمە لات شکایەتی لێ بکەم، بەڵام کە بینیم تۆش وەکو منی، ئیتر بڵێم چی؟! بۆیە هەڵسام و ڕۆشتم؟!

ئەمیری ئیمانداران کە ئەمەی لێ بیست، پێی گوت: برای خۆم.. ژنەکەم خواردنم بۆ ئامادە دەکات! جلەکانم بۆ دەشوات! ئیش و کارەکانم بۆ جێبەجێ دەکات! منداڵەکانم بۆ بەخێو دەکات! جا ئەگەر جارێك خراپەیەکی کرد، ئەوا بۆ ئێمە نییە خراپەکانی گەورە بکەین و چاکەکانی لەبیر ببەینەوە؟! باشیش بزانە ئەی برای ئیسلام، لە نێوان ئێمەو ژنەکانماندا دوو ڕۆژ هەیە، یان ئەوەتا ڕۆژێك دێ ئێمە دەمرین و لەدەستیان ئیسراحەت دەکەین!! یانیش ڕۆژێ دێ ئەوان دەمرن و لە دەستمان ئیسراحەت دەکەن!

ئیتر دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە، کابرا چۆن بە غەمباری هاتبوو، بە پێچەوانەوە بە دڵی خۆش گەڕایەوە ماڵ!

## موسڵمانان زانستخوازن

کەمیلی کوڕی زیاد دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبی تالیب (ڕەزای خوای لێبێ)، پێی گوتم: زانست باشترە لە پارە، چونکە زانست پارێزگاریت لێ دەکات، بەڵام هەرچی پارەیە، دەبێ تۆ پارێزگاریی لێ بکەیت!! لە لایێکی دیکەدا زانست بۆ خاوەنەکەی دەبێتە هۆی



ئەوەی، لە ژیانیدا زاناکە گوێلێگیراو بێ و لە دوای مردنیشیدا لەبەر چاوی خەڵکی جوان بێ.. بەڵام خاوەنی پارە، یان ئەو کەسەی بە هۆی پارەوە گەورە بووە، بە نەمانی پارەکە گەورەییەکەی نامێنێ، زۆر جار هێشتا خاوەن پارەکە ماوەو زیندووە، بەڵام پارەکەی نەماوەو لەدەستچووە.. هەرچی زاناکانن، ئەوان هەتا دونیا بمێنێ، هەر دەمێنن!!

## موسڵمانان زوو توڕە نابن

پیاوێك هاتە لای موهەللەبی کوڕی ئەبی صەفرە، کە موهەللەب یەکێکە لە فەرماندە عەسکەرییە زۆر گەورەو دیارەکانی دەوڵەتی ئومەوی، ئەوەندە ئازا بووە، لە سەردەمی خۆیدا گوتوویانە: دایکان دەستەوسانن لەوەی کوڕێکی دیکەی وەکو موهەللەب بەرهەمبێنن.

پیاوێك هاتە مەجلیسی ئەو موهەللەبە ئازایەو هێرشی کردە سەری و جوێنی زۆر خراپی پێدا، بەڵام موهەللەب دانی بەخۆیدا گرت و هیچی نەگوت!! پیاوێك بەوێدا تێپەڕی، کە ئەوەی بینی، لە کابرای دەم بە جوێن هاتە دەنگ و لەگەڵیدا بەشەڕ هات و شکاندی، پاش ئەوە ڕووی لە موهەللەب کرد و پێی گوت: ئەوە تۆ بەرگریت لە خۆت نەکرد؟!



موهەللەب وەڵامی دایەوە: برازای ئازیزی من.. من پێم وایە سەرکەوتن لە دان بەخۆداگرتنەو بەوە بەسەریدا سەردەکەوم، ئەگەریش بێت و دانم بەخۆدا نەگرتبووایە، بەسەریدا سەرکەوتوو نەدەبووم!!

## لای موسلمانان پاشا و خەلیفە

## بچووکترن لە زاناکان

خەلیفەی عەباسی بەناوبانگ هارونی ڕەشید، لە سەفەرێکیدا بۆ حەجی ماڵی خوا، هاتە شاری مەدینە، لەوێ بە دوای زانای گەورە (مالیکی کوڕی ئەنەس)یدا هەنارد، بۆ ئەوەی بێتە لای و پێشوازی لێ بکات، چونکە بۆی باسکرابوو، کە ئەو پیاوە زانایەکی زۆر گەورەیە، بەڵام مالیکی کوڕی ئەنەس لەگەڵ نێردراوی خەلیفە نەهاتە لای خەلیفە، بە پێچەوانەوە بەو نێردراوەی خەلیفەی گوت: بڕۆ بە ئەمیری ئیمانداران بڵێ: ئەوەی زانستخواز بێ، بە دوای زانسدا دەچێ، بەڵام زانست بە خۆی بۆ لای کەسێ ناچێ.

خەلیفە بەوە تێگەیشت، کە ئەو زانایە ناچێتە لای خەلیفەو زانستەکەی بەلاوە گەورەترە لە پۆست و پایەی خەلیفایەتی، بۆیە ویستی خۆی بچێتە ماڵی مالیك، بەڵام جوابی نارد، کە کاتێکی بۆ دیاری بکات و تیایدا پێشوازی لە خەلیفە بکات.





مالیکی زانا ئەوەشی ڕەتکردەوەو گوتی: دەبێ وەکو عامەی خەڵکی بێیە ماڵەکەم، چونکە ئەگەر عامە لە بەدەستهێنانی زانستدا ڕێی لێ گیرا، ئەوە زانستەکە بە تەنیا بۆ کەمینە چ سوودێکی نابێ.

## موسڵمانان خاوەنی چاکە گەورەکانن

جاریەیەکی ئیمامی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب (ڕەزای خوای لێ بێ)، هاتە لای و هەندێ تاڵی ڕەیحانی بە دیاری پێدا؟! ئەویش ئەو ڕەیحان و بوخورانەی لێوەرگرت و پێی گوت: خوشکێ تۆ لە ئێستاوە ئازادی!

جاریەکە سوپاسی خوای کردو بە دڵی خۆشەوە چووە دەر!! ئەوانەی لەلای دانیشتبوون پێیان گوت: ئەی ئیمام.. تۆ لەبەر چەند تاڵە ڕەیحانێك جاریەیەکت ئازاد کرد!!

ئیمام حەسەن گوتی: ئەوە لەبەر ئەو ئایەتە پیرۆزەی خوای گەورە بوو، کە تیایدا دەفەرموێ: ﴿وأذا حييتم بتحية فحيوا بأحسن منها﴾.. واتە: ئەگەر یەکێك سڵاوێکی لێ کردن، ئەوا بە باشتر وەڵامی بدەنەوە!! منیش گوتم: ئەدی ئەگەر ڕەیحانی بە دیاری پێدام، لەوە باشتر چییە پێی بدەمەوە؟! بۆیە ئازادم کردو پێم وابوو، لە دیارییەکەی ئەو گەورەتر، هەر ئازادکردنیەتی.





## موسڵمانان هەموو شتێك بۆ یەكتر دەبەخشن!

بانگی پیرۆزی بەیانی لە دەمی بانگخوێنە زۆر دەنگخۆشەکە بەرزبوویەوە، ئەمە بانگی خەڵکی دەکرد، ئەوانەی خۆیان بە ئیماندار و موسڵمان دەزانن، لە خەوەکەیان هەڵسن و بەدەم ئەو بانگەوازە پیرۆزەوە بێن! ئاخەر ئەوە بانگەوازی ژیانی ڕاستەقینەیە! بانگەوازی خۆڕزگارکردنە لە ئاگر و ناخۆشییەکانی دیکەی قەبر و دۆزەخ، ((حی علی الصلاه ... حی علی الفلاح)).. (وەرن نوێژ بکەن... وەرن خۆتان ڕزگار بکەن)!! بۆیە بانگخوێنەکە دووجاری دیکەش بانگی کردن: ((الصلاه خیر من النوم... الصلاه خیر من النوم)).. بەڵێ خەڵکینە نوێژ باشترە لە خەو.. نوێژ باشترە لە خەو..

ئەوسا ڕۆژگارێك بوو، ئیمانداران هەموویان لەوە دڵنیابوون، دەیانزانی هیچ ڕاستییەك نییە لەوە گەورەتر!! بۆیە بە سوپاسی ئەڵڵای خوداوە، لە نێو جێگەکانیان هەڵسان و هاتن دەستنوێژی بەندایەتی و ملکەچییان بۆ خودای گەورە شوشت!! بانگی دووەمیش دیسانەوە جەختی لەسەر هەمان ((حی علی الصلاه حی علی الفلاح))ەکەی پێشووتر کردەوە، بۆیە هەر موسڵمان بوو لە ماڵە سادەکەی خۆی دەهاتە دەرو بەرەو سەرچاوەی بانگەکە دەهات، لەمەشدا یەکپارچە شەوق و ئومێد بوون، نوقمی خۆشی و شادومانی بوون، دەیانزانی گەورەیی ئادەمیزاد بە گەورەیی کردەوەکانی





دەبەستریتەوە، ئەو کردەوەیەی ئیستایان وەڵامدانەوەی بانگی دەعوەت و پەیمانی بەخشینی عەفوی خوداییە، ئیتر چۆن شادومان نابن؟! ئیستا چەند دەقیقەییەکی ترە، دەگەنە ماڵی خودا، بە (بسم الله.. السلام على رسول الله.. ربي افتح لي أبواب رحمتك واغفر لي ذنبي يا الله) دەچنە نێو ئەو ماڵە پیرۆزە، کە خۆشەویسترین شوێنی سەر پشتی زەوی لە لای خوداوە ماڵەکانی خۆیەتی!!

ئەم موسڵمانانە ئێستا دەگەنە نێو ئەو ماڵە پیرۆزو خۆشەی خودا، کە مزگەوتی پێغەمبەری خودایە (صلى الله عليه وسلم)، دوو ڕکات نوێژی تەحییەی مەسجید دەکەن و هەڵدەستنەوە بەرەو ڕەوزەی شەریف دێن، لەوێش بە ئەدەبێکی زۆرەوە سڵاو بۆ پێغەمبەری ئاشتی و خۆشەویستی (درودو سڵاوی خوای لەسەر) دەکەن، ئینجا هەنگاوێك لەولاوە چاوێك بۆ (ئەبوبەکری صدیقی) هاوەڵە خۆشەویستەکەی پێغەمبەریش درێژدەکەن و سڵاوێك بۆ ئەویش دەکەن!! دوای ئەوە دێنە پێش ئەمیری ئیمانداران، خەلیفەی دووەمی موسڵمانان و خۆشەویستی هەقخواز و دادگری پێغەمبەری خودا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)!! سڵاوی خۆشەویستی و ڕێزی موسڵمانانەیان بۆ ئەویش دەکەن و ڕووەو کەعبەی پیرۆز لە دوایەوەی دادەنیشن، بۆ ئەوەی بڵێ: هەڵسنەوەو نوێژی بەیانییان بۆ بکات.









ئەم ساتانە چەند دڵگیر و خۆشـن؟! چـەند پـڕ لـە دڵنیـایی و ڕەحمات و بەرەکاتی خـودایین؟! بـە هێمنـی دادەنیشـن و پـڕ بـە دڵ تەسبیحات بۆ خودا دەکەن، دوعا بۆ موسڵمانانی زیندوو مـردو، بـۆ سوپای فاتیحی موسڵمانان لە بەرەکانی شـام و فـارس، بـۆ داپـیرەو باپیرە نـەخۆش و پەککەوتـەکان، بـۆ ژن و منداڵـە ئازیزەکـان، بـۆ نەوەکانی داهاتوو، دوعا بۆ یەکـە یەکـەی هـەموو ئەوانـە دەکـەن، چاوەڕوانی ئەوەشـن، ئێسـتاکە بانگخوێنـە دەنگخۆشـەکە، قامـەت بەرزدەکاتەوەو ئیدی هەڵدەسـتنەوە نوێـژی بەندایـەتی و داننـان بـە گەورەیی خودا دەکەن!!

قامەت بەرزدەبتەوەو ئەمیری ئیمانـداران (ئـەڵڵاهو ئەکبـەر)ی تەحریم بەرزدەکاتەوە، ئیماندارانیش یەك دڵ و یەك گیان لـە دواوەی ڕیزی ڕاست دەبەستن و نوێژەکانیان دادەبەستن، ئەمیری ئیمانداران بـە دەنگە بەجۆش و پڕ لە ئیمانەکـەی فاتیحـەی نوێژەکـەی دەخـوێنێ، پـیرۆزی ئایەتـەکان و ئیمـانی ئـەمیری ئیمانـداران ئـاوێزان دەبـن و هەمووان دەخەنە دونیایەکی دیکـە، لـە پـڕ خشـەیەك و وەشـاندنی خەنجـەرێك و پچـڕانی دەنگەکـەی ئـەمیری ئیمانـداران ئارامییەکـە دەشێوێنێ؟!!

ئەمە چی بوو؟! ئەمە چی ڕوو دەدا؟؟!! وەشـاندنەکان بـەردەوام دەبێ و چەندین موسڵمانی تریش زامدار دەکرێن، تا ئیماندارێك لـەو





ئەگریسە نەزان و خوێنخۆرە ئاگرپەرستە نزیکدەبێتەوەو شمشێرەکەی ئاراستەی دڵی دەکات!! هەرچۆنێك بێت نوێژەکە تەواوەکرێت، دوای ئەوە، موسڵمانان هەڵدەستنەوە تەماشای ڕووداوەکە دەکەن؟!

چ ببینن؟! هەر خوێنەو لە زامەکانی هاوەڵە بەڕێزەکانیان لێرەو لەویَ وەکو فوارەی ڕۆحی هیوا دێتە خوارێ؟!

ئـەمیری ئیمانـداران هـەموو گیـانی خوێنـە، بـەڵام خەنـدەی پەرپوتە سەر لێوو دەڵێت: سوپاس بۆ خودا بە ئاواتی خۆم گەیشتم!! بەڵام تخوا بزانن، ئەوەی لێی دام موسڵمانە، یان نا؟!

وەڵامی دەدەنەوە: نەخێر موسڵمان نییـە، زەنـدیقێکی فارسـەو تەنانەت نوێژێکیشی بۆ خودا نەکردووە؟!

ئەمیری ئیمانداران زیاتر دڵخـۆش دەبـێ؟! ڕووی جـوانی زیـاتر دەگەشێتەوە، دیسانەوە سوپاسـی خـودای گـەورە دەکـات و دەڵـێ: سوپاس بۆ خودا، ئەوەی لێـی دام تـەنیا سوجدەیێکیشـی بـۆ خـودا نەبردووە!!

بەڵام موسڵمانان نارەحەت بوون!! باری غەم لەسەر لێویان بـاری و بووە ئاخ و داخ هەڵکێشان!!

خاتوو عائیشەی دایکی ئیماندارانیش (ڕەزای خوای لـێبێ) لـە حوجرە پیرۆزەکەی تەنیشتەوە هەسـتی کـرد، شـتێك ڕوویـدا، زانـی







دوژمنان فرسەتیان لەو کاتی ئاشتی و بێ چەکییەی موسڵمانان وەرگرت و ئامانجێکی گەورەیان پێکا، بۆیە چاوەکانی پڕاوپڕ فرمێسك بوون و دڵی ئەویش پڕی غەم و خەفەت بوو!! ئا لەو کاتەدا لە دەرگای ژوورەکەی درا.. دەبێ کێ بێ لەم کاتەدا؟! فەرمووی کردو پرسی چیتان دەوێت؟!

دەنگەکەی دەرەوە هی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ئەمیری ئیمانداران بوو، بە ڕێزەوە پێی گوت:

- ئەی دایە گیان.. ئەی دایکی ئیمانداران.. سڵاوی خوات لێبێ.. باوکم گەیشتە ئاواتی خۆی و کەمێکی دیکە دەگاتە خزمەت پێغەمبەر و یارانی!! سڵاوتان لێدەکات و دەپرسێ: ئایا ڕوخسەتی دەدەن لە حوجرەی پیرۆزدا لەلای ئازیزو سەروەرانی خۆی پێغەمبەر و ئەبوبەکردا بنێژرێت؟!

بەم پرسیارە، ئیدی خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لەسەر) لە پێکان و شەهیدکردنی ئەمیری ئیمانداران گومانی نەما!! خەم و خەفەتێکی زۆری بۆ خوارد؟!! بەڵام چاوەڕوانی داوایەکی وەهاش نەبوو؟! ئەمە چ دەبیسێت؟! حوجرەکە تەنیا جێی یەك گۆڕی دیکەی تێدا دەبێتەوە، ژووری خۆیەتی و بۆ خۆی داناوە، ئاخەر کەس هەیە ئەم شوێنە پیرۆزە بداتە یەکێکی تر؟! کەس هەیە









هاوسێیەتی پێغەمبەر و ئەبوبەکر لە دەست خۆی بدات و بۆ کەسێکی دیکە خۆی دووربخاتەوە؟!

ئەمە داوایەکی زەحمەتە؟! بڕیارێکی گەورەیەو ئاسان نییە، یەکێك بتوانێ بڕیاری وەها بدات؟!

بەڵام خاتو عائیشەی دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لەسەر) دەتوانێ کاری وەها بکات!! ئاخەر ئەو قوتابی ڕێزی پێشەوەی پەروەردەکەی پێغەمبەرە (درودو سڵاوی خوای لەسەر)!! ناتوانێ داوای خەڵکی ڕەتبکاتەوە، ئەگەر داوایەکە ئەم داوایە زەحمەتەش بێت؟! خۆ ئەگەر داواکەریش ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب بێت، ئەوا چاری نییە بێگومان باشتر لە داوای هەریەکێکی دیکە جێبەجێی دەکات!! بۆیە ڕەزامەندی نواند، بە عەبدوڵڵای گوت:

- وەڵڵاهی جێی تەنیا یەك کەس لەم حوجرەیەم ماوە، ئەویشم بۆ خۆم دانابوو، بەڵام مادام ئەمیری ئیمانداران داوای دەکات، ئەوا دامە ئەوو بچۆ موژدەی بەرێ من پیرۆزبایی ئەو شوێنەی لێدەکەم!!

عەبدوڵڵا ئەم هەواڵە خۆشەی بۆ باوکی هێنایەوە، دڵخۆشی و ئاسوودەیی ئەمیری ئیمانداران گەیشتە لوتکە!! ئیدی پڕ بە دڵ سوپاسی خوای گەورەی کرد، چونکە شەهیدی و ئەسپاردەکران لە خزمەت پێغەمبەری سەرورەرو ئەبوبەکری خۆشەویستی بە قسمەت کرد!!



هەروەها سوپاسی خاتوو عائیشەی دایکی ئیماندارانیشی کرد، کە ئەم چاکە گەورەیەی لەگەڵ کرد!!

ئینجا بۆ دواجارە تەماشاییێکی دیکەی موسڵمانانی کرد، بە چاوە پڕ لە ئامۆژگاری و نەسیحەتەکەی بۆیانی ڕوانی و وای تێگەیاندن، کە هەمیشە لەسەر دینەکەو لە خزمەت دینەکە بمێننەوە، لە ماوەی حەفتاو دوو سعاتدا خەلیفەیەك لە نێو شەش لە سەحابە گەورەو بەڕێزەکان هەڵبژێرن و درێژە بە ژیانی ئاسایی بدەن!!

دوای هەموو ئەوە، کە لە ماوەی چەند دەقیقەیەك ڕوویان دا، ئەمیری ئیمانداران (عومەری کوڕی خەتاب)ی خەلیفەو خۆشەویستی موسڵمانان (ڕەزای خوای لێ بێ)، بە خۆشحاڵی و ئاسوودەییەکی زۆرەوە، دوایین هەناسەی هەڵدەمژێ و موسڵمانان بە داخ و پەژارەوە بەجێ دێڵێ!!

ئێستاکە دەپرسین: کەس هەیە لە شوێنی خاتوو عائیشەی دایکمان بووایەو ئەو جێیە خۆشەویستەی خۆی بدابووایە ئەمیری ئیمانداران؟!

ئەوە چ خۆشەویستییەکی گەورەیە؟! وا لە ئەمیری ئیمانداران دەکات بەو سادەییەوە، بەو هەموو ڕێزو حورمەتەوە داواکەی لە خاتو عائیشە بکات؟!





ئەدی ئەوە چ چاکەیەکی گەورەیە، کە بەبێ دوو دڵی دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ)، داواکەی ئەمیری خۆشەویستی ئیمانداران بەجێ دێنێ و دەست لە گەورەترین مافی خۆی لە پێناو ڕەزامەندی ئەو هەڵدەگرێ؟!

## موسڵمانان لە لوتکەی حەیا دان

خاتو عائیشەی دایکی ئیمانداران (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێت: من دەچوومەوە ئەو ژوورەم، کە پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) و باوکمی تیابوو (ڕەزای خوای لێ بێ)، جلەکانم لا دەبردن، دەمگوت لەبەر ئەوەی ئەمانە پیاوو باوکمن، بەڵام کە عومەری کوڕی خەتابیش (ڕەزای خوای لێ بێ) لەوێ شاردرایەوە، ئیتر جارێکی تر ئەو جلانەم لەبەردا لانەبردوون، ئەمەش وەکو حەیاییێك لە عومەر!!

(... ئەم بابەتە (الحاكم) لە (المستدرك)ەوە گێڕاویتیەوەو لەسەر شەرتی هەردوو شێخەکان بە صەحیحی وەرگرتووە).

مەبەستی خاتو عائیشە ئەو جلە زیادانەیەتی کە ئافرەت پۆشتەو داپۆشراو دەکەن و هی دەرەوەن، کە بێگومان لە ناو ماڵی خۆیدا ئافرەت پێویستی بە ئیسرحاتەو پێویست نییە هەموو ئەو جلانەی دەرەوەی هەر لەبەر بمێنێ، بەڵام دەبینین لەبەر بوونی خەلیفە







عومەر (ڕەزای خوای لیَ بیَ) لە ژوورەکەی بە مردوویش، نەك بە زیندوویی، ئینجاش خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لیَ بیَ) حەیای لیَ دەکات و هیچ لە جلەکانی دەرەوەی لە ناو ماڵ و کاتی ئیسراحەتی خۆیشی لانابەریَت!! کچان و دایکانمان و تەنانەت کوڕو پیاوانیشمان، ئەوانەی خۆیان بە موسڵمان دەزانن، لە کوێی ئەو حەیایەین؟!

## موسلمان ئەخلاقیان بەلاوە گەورەترە

موسای کوڕی ئیسحاق لە سەدەی سێیەمی هیجری قازی (ڕەی و ئەهواز) بوو، ڕۆژێکیان دانیشتبوو، گوێی لە کێشەکانی خەڵکی دەگرت، یەك لە کێشەکان هی ژنێك بوو، ئەو ژنە سکاڵای لەسەر مێردەکەی خۆی تۆمار کردبوو، دەیگوت: مێردەکەم پێنجسەد دینار مارەییم قەرزارەو ئەو پارەیەم پیَ نادات.. بەڵام مێردەکەی ئەو قسەیەی ڕەتدەکردەوە، دەیگوت: شتی وەها نییە.. بۆیە قازی بە ژنەکەی گوت: تۆ شاهێدت هەیە؟

ژنە گوتی: بەڵیَ ئەوەتا ئەو دوو پیاوەی هێناومن، هەردووکیان شاهێدن.

قازی بە یەکەمیانی گوت: تەماشای ئەو ژنە بکە، بۆ ئەوەی لە شاهێدی دانەکەت ئاماژەی بۆ بکەی.. شاهێدەکە هەڵسایەوە ڕووی لە ژنەکە کرد، پێی گوت: هەڵسە.



پیاوی ژنەکە گوتی: چیتان لێی دەوێ!

گوتیان: دەبێ ژنەکەت پێچەکەی لابدات و شاهێدەکە تەماشای بکات، بۆ ئەوەی دڵنیا بێ لەوەی ئەو ژنەی شاهێدی بۆ دەدات، خۆیەتی!!

پیاوی ژنە بیری کردەوە!! ئەو کارەی زۆر لەسەر دڵ قورس بوو، مردنی پێخۆشتربوو لەوەی، دوو سێ پیاو دەم و چاوی ژنەکەی ببینن، چەندی کردی، بۆی قەبوڵ نەکرا!! بۆیە هاواری کرد: نا قازی نا، وازی لێبێنە، من دان دەنێم ئەو ژنەی من پێنجسەد دیناری مارەیی لەلای منە، ئیدی نە پێچەی لادەدات و نە دەشهێڵم کەس بیبینێ.

کە ژنە ئەوەی لە پیاوەکەی بیست، ئەو پیاوەی لەبەر چاو گەلەك گەورە بوو، چونکە شەرەفی پاراست و نەیهێشت جوانییەکانی بکەوێتە بەر چاوی خەڵکی!! بۆیە ئەویش ڕووی کردە قازی و پێی گوت: جەنابی قازی تۆ شاهێد بە، منیش لە دونیاو دوامایی ئەو پیاوەی خۆمم لەو مارەییە بەخشی و جارێکی دیکە داوای ناکەمەوە.

قازی ئەوەی زۆر بەلاوە خۆشبوو، بەوانەی دەوروبەری گوت: ئەو هەڵوێستە لە خانەی ڕەوشتە بەرزەکان بنووسن.











## حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتاب

حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتاب و خێزانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).. دایکی ئیماندارانە، خاتونێکە خاوەنی نهێنییەکانی پێغەمبەرە (درود و سڵاوی خودای لەسەر)، چونکە کاتێك زەیدی کوڕی سابت بە فرمانی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خودایان لێبێ)، لە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز بووەوە، ئەو لاپەڕانەی قورئانی پیرۆزیان تیا کۆکرابووەوە لای ئەبوبەکری خەلیفە بوون، تا ئەو وەفاتی کرد و لە دونیا دەرچوو، دوای ئەوە خرایە لای خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خودای لێبێ)، ئەویش تا وەفاتی کردو لە دونیا دەرچوو، ئەم قورئانە پیرۆزەی هەر لا مایەوە، دوای ئەویش خرایە لای دایکی ئیمانداران، حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتاب و خێزانی دڵسۆزی پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەر)، دوای ئەوە خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان لە خاتوو حەفصەی وەرگرت، بۆ ئەوەی چەند دانەیەك قورئانی دیکەی لەبەر بگرێتەوە، ئینجا کە ئەو کارەشی کرد، جارێکی تر دانە بنجییەکەی گێڕایەوە لای خاتو حەفصەی دایکی ئیمانداران (ڕەزای خودایان لێبێت)، ئیتر ئەمجارەش لای ئەو مایەوە، هەتا ئەویش کۆچی دوایی کرد و لە دونیا دەرچوو.





خاتو حەفصە بە پێنج ساڵ بەر لە هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سلاوی خودای لەسەر) لە دایکبوو، بنەماڵەکەی یەك لە بنەماڵە بەرێز و دیارەکانی مەککە بوون، باوکی ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب و دایکیشی خاتو زەینەبی کچی مەزعونی کوڕی حەبیب بوو. کە بنەماڵەی هەریەکە لە دایك و باوکیشی لای مەککەییەکان ناسراوو خاوەن ڕێزو پایە بوون.

خاتوو حەفصە کە گەورە بوو، شووی بە خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمیی قوڕەیشی کرد، هەرزوو پێکەوە موسڵمان بوون و لەگەڵ یەکەم دەستەی موهاجیرانی ئیسلام پێکەوە بەرەو حەبەشە هیجرەتیان کرد، دوای ئەوە گەڕانەوەو پێکەوە بۆ مەدینە هیجرەتیان کرد، خونەیسی مێردی بەشداری جەنگی بەدری گەورەی کرد و ڕۆڵی موسڵمانانەی خۆی تیا بینی، دواتر لە جەنگی ئوحودیش بەشداریکرد، بەڵام لەو جەنگەی دووەمەدا شەهید بوو، بەمەش خاتوو حەفصە، کە تەمەنی لە بیست و یەك ساڵ تێپەڕی نەدەکرد، بە بێوەژنی مایەوە، بۆیە ئەمیری ئیمانداران عومەری باوکی خەمی ئەو کچەی خۆی خواردو حەزیکرد بە زوویی دایبمەزرێنێتەوە، ئەوەبوو کە زانی عیددەی خاتوو حەفصە تەواو بووە، هاتە لای عوسمانی کوڕی عەفان و پێی گوت: حەفصە بە شوو دەدەم، حەز دەکەم تۆ بیخوازی.







بەڵام ئیمامی عوسمان قەبوڵی نەکرد و گوتی: ئێستاکە بە نیازی ژنهێنان نیم.

ئینجا هاتە لای ئەبوبەکری صدیق و هەمان شتی بۆ خستەڕوو، بەڵام ئەویش ڕازی نەبوو و گوتی ژن ناهێنم.

بەمەش ئیمامی عومەر بێتاقەت بوو و هاتە لای پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەر)، سکاڵای خۆی لە دەست عوسمان و ئەبوبەکر دەربڕی، کە ئەوان پاساوێکی قەناعەتپێکەریان نەبووە بۆ نەویستنی حەفصەی کچی، بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەر) دڵی خۆشکردو فەرمووی: ((یەکێك حەفصە دێنێ لە عوسمان باشترەو عوسمانیش یەکێك دێنێ لە حەفصە باشترە)).

دوای ئەوە پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەر) خاتو حەفصەی خواست، بەوەش سوکنایی دڵی ئیمامی عومەر وەکو باوکێکی بەسۆز و ئیماندار بۆ بێغەمبوونی کچەکەی هات، پاش ئەوە ئەبوبەکری صدیق چاوی بە ئیمامی عومەر کەوت، پێی گوت: لێم تورە مەبە براکەم، پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەر) باسی حەفصەی لەلام کردبوو، کە بە نیازە بیخوازێت، بەڵام من نەمویست نهێنی پێغەمبەری خۆشەویست



(درودو سڵاوی خودای لەسەر) ئاشکرا بکەم، خۆ ئەگەر ئەویش نەیویستبووایە، دڵنیابە من بە حەفصە ڕازی دەبووم.

شووکردنی خاتو حەفصە بە پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەر) لە ساڵی سێیەمی هیجرەتدا بوو، ئەوەش ڕێزنانی پێغەمبەری خۆشەویست بوو (درودو سڵاوی خودای لەسەر) لە خۆی و لە عومەری باوکی و لەبەر ئەوە بوو، کە زۆری خۆشدەویستن.

خاتوو حەفصەی دایکی ئیمانداران خواپەرست و لەخواترسێکی گەورە بوو، شەو خەریکی شەونوێژ و صەڵاتی تەهەجوودو ڕۆژیش بە ڕۆژوو بوو، بۆیە خودای گەورە ڕێزی لێناو کردییە یەك لە خێزانەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەر) لە دونیاو لە دوواماییش.

خاتوو حەفصە شەست فەرموودەی ڕیوایەت کردووە، تەواوی سەرکەوتنەکانی پێغەمبەری خوداو موسڵمانانی تا دووایین ڕۆژەکانی خیلافەی ڕاشیدی بە چاوی خۆی بینیوە، دوای ئەوە وادەی ئەجەلی هات، گوتوویانە لە کاتی بەیعەتدان بە حەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خودایان لێبێ) لە جەمادی یەکەمی ساڵی چل و یەکی هیجرەت کۆچی دوایی کرد، هەیشە دەڵێت: لە ساڵی چل و پێنجی هیجری کۆچی دوایی کردووە.







خاتوو حەفصە بە دایکی هەژاران (ئوممولمەساکین) ناونرا، چونکە زۆر بە بەزەیی بوو لەگەڵ هەژاران، دڵی زۆر نەرم بوو لەگەڵیان، خواردنی پێدەدان، بەرگی دەکردن، پێویستییەکانیانی جێبەجێدەکرد، ئیش و کارەکانی بۆ ڕادەپەڕاندن.. هەروەها وەکو گوتمان: بە پارێزەری قورئانی پیرۆز و خاوەنی نهێنییەکانی پیغەمبەریش (درودو سڵاوی خوای لەسەر) ناودەنرێت.

## موسڵمانان بشکەون، هەر خێری تیایە

کاتێك مەغۆلییەکان هاتن بەغدایان داگیر کرد، خەڵکێکی زۆریان دیل کرد، یەك لەوانە زانایەکی ئاینی بوو، ئەو زانایەیان هێنایە لای کچی پاشا، کچە لێی پرسی: ئێوە ناڵێن: خوای ئێمە بە توانایەو سەرمان دەخات بەسەر کافران، دەی ئەوە ئێمەی کافری بەسەر ئێوەی موسڵمان سەرخست!! ئەمە بۆ وا بوو؟! دیارە قسەکەی ئێوە درۆیەو ڕاست نییە!

زاناکە گوتی: نەخێر قسەکەی ئێمە ڕاستەو هەڵە قەبوڵ ناکات.

کچی پاشا پرسی: چۆن؟!

زاناکە گوتی: تۆ شوانت بینیوە لە لای مەڕەکانی؟

کچە پاشا گوتی: بەڵێ.









زاناکـه گـوتی: بینیوتـه ئـەو شـوانه چـەند سـەگێکی لەگـەڵ مێگەڵەکەی دایە؟

کچە پاشا گوتی: بەڵێ.

زاناکە گوتی: باشە شوان ئەو سەگانەی بۆ چییە؟

کچە پاشا گوتی: بۆ ئەوەیە، ئەگەر مێگەڵەکە لە ڕێدا لایان دا، ئەو سەگانە بە دوایاندا بنێرێ و بیانهێننەوە سەر ڕێگا.

زاناکە گوتی: دەی ئەو مەسەلەیەی ئێمەش هـەر وایـە!! ئێمـە لامان دابوو، لۆیە خوای گەورە ئێوەی سەگی هەناردە سەر ئێمە، بـۆ ئەوەی بە هۆی ئێوەوە بمانهێننتەوە سەر ڕێ.

کچە پاشا سەری بەردایەوەو قسەی نەکرد.

## موسڵمانان بە ویژدانن

عەبدوڵڵای کوڕی عامڕی تەمیمی، کـە یەکێکـە لـە تابیعییـە بەڕێزەکان، خانوی ماڵی خالیدی کوڕی عوقبەی لەو پیاوە بە نـەوەت هەزار درهەم کڕی، کاتێك شەو هات، گوێی لێ بوو، دەنگـی گریـان لە ماڵی خالیدەوە بەرزدەبێتەوە!! ئەوەی پێ ناخۆش بوو، پرسی: ئەو گریانە چییە؟!







چوون سۆراغیان کردو هاتن هەواڵیان بۆ هێناوە: ئەو گریانە هی ژن و منداڵەکانی خالیدەو بۆ خانوەکەیان دەگریێن؟!

عەبدوڵڵا ترسی ئەوەی لێنیشت، ئەوە پێشێلکردنی مافی جیرانەتی بێ، بۆیە بە غولامەکەی گوت: دەی برۆ لایان و پێیان بڵێ: خانوەکەو ئەو پارەشی پێم داون، هەمووی بۆ ئەوان بێ و با ئارام بنەوە، بە نارەحەتی نەمێننەوە!!

## موسلمان لەگەڵ خراپیش، هەر چاکە

زانایەك ژنەکی زۆر خراپی هەبوو، هەمیشە بەدەستیەوە نارەحەت بوو، قوتابیەکانی پێیان دەگوت: ژنەکەت چت لێ دەکات؟!! سیفەتی چییە؟! بۆچی وەها ئازارت دەدا؟!!

وەڵامیدەدانەوە، دەیگوت: کورینە وازی لێبێنن!! ئەو ژنی منە، داکی منداڵەکانمە، کەس هەیە نهێنی ژنی خۆی ئاشکرا بکات؟!!

بەم شێوەیە بێدەنگ دەبوو لەسەر شاردنەوەی سیفەتە خراپەکانی ژنەکەی و نهێنییەکانی دەپاراست، دوای ئەوەی تەڵاقیشی دا، قوتابیەکانی لێیان پرسی: مامۆستا ئێستاکە ئەوە ماوەیەکی باشە تەڵاقت داوە، دەکرێ ئێستاکە پێمان بڵێی سیفەتە خراپەکانی ژنەکەت چی بوون، کە تۆیان ئازار دەدا؟!!







مامۆستا دیسانیش ئەو سیفەتانەی شاردەوەو پێی گوتن: کوڕینە جاران ژنی خۆم بوو، بۆم باس نەکردن چی دەکات، ئێستاکە ژنی یەکێکی دیکەیە، چۆن دەبێ باسی بکەم!!

## موسڵمان ئازار بۆ خۆی دەخوازێ نەك بۆ براکانی تری

زانایەکی دیکەی گەورە دەبێ، ئەویش ژنەکەی پێچەوانەی خۆی دەبێ، ئەو زانایە چەندەی باش و لەخواترس دەبێ، ژنەکەی دوو ئەوەندە خراپ و بێ دین دەبێ، قوتابیەکانی پێی دەڵێن: مامۆستا بەداخەوە تووشت بە تووشی ئەو ژنەت بووە، بریا ئەو ژنە هی یەکەکی دی بووایە!!

مامۆستا وەڵامیان دەداتەوە: ناوەڵڵا کوڕینە، سوپاس بۆ خوا تووشی من بوو و تووشی برایەکی دیم نەبوو، با ئازاری من بدا، قەیدی ناکا...!!

ئەوجارە پێی دەڵێن: مامۆستا مادام وەهایە، دە ئەو ژنەت تەڵاقبدەو یەکەکی دی بینە!!

مامۆستا وەڵامیان دەداتەوە: ناوەڵڵا تەڵاقیشی نادەم، مەبادا بچێ مێرد بە برایەکی دی بکاتەوە، جەرگی ئەویش کون کون بکات!! لێگەڕێن، با ئازارەکانی هەر لۆ من بی و نەگاتە برایەکی دیش!!







## موسڵمان منداڵیشی هەر بە بەزەییە

منـــداڵێك كۆیلـــەی یـــەك لـــە دەوڵەمەنـــدەكان دەبـــێ، ئـــەو دەوڵەمەندەدە باغێكی دەبێ، ئەو منداڵە لەو باغە كاری بۆ دەكـات، ڕۆژانە خاوەنی ئەو باغە سێ كولێرە دەداتە ئەو منداڵـە، ڕۆژێكیـان منداڵەكە كولێرەكان وەردەگرێ و لـە باغەكـە دێتـە دەر، چاوی بـە سەگێكی برسی دەكـەوێ، دەبینـێ سـەگەكە لـە برسـان هێـزی تیـا نەماوە، ئەویش نازانێ چ بكات، لە دڵی خۆیدا دەڵێـت: مـن تـەنها سێ كولێرەم هەیە، بەشی سـێ ژەمـەكانی مـنن، ئـێ ئەگـەر هـەر كولێرەیەك بدەمە ئەو سەگە، دەبێ ژەمێك بە برسـییەتی بمێنمـەوە!! بەڵام تەماشا دەكات سەگەكە زۆر برسییە، بۆیە بـەزەیی زۆری پێـدا دێتەوەو دەڵێ: ئەو سەگە بەستەزمانە برسییەتی، با من لـە پێنـاوی خوا كولێرەیەكی بدەمێ، ئەوجا دڵنیامە خوداش من لەبیر ناكـات و نایەڵێت: منیش برسی بم.

ئیـدی ئـەوە دەبـێ كولێرەیـەكی دەداتـێ، سـەگەكە یەكسـەر هەڵیدەگرێتەوەو دەیخوات، بەڵام برسییەتی پێ ناشكێ و چـاوەڕووانی زۆرتر دەكات، بۆیە منداڵەكە پشت بـە خـودا دەبەسـتێ و كـولێرەی دووەمیشی پێدەدات، سەگەكە ئەویش دەخـوات و هێشـتا برسـییەو چاوەڕووانی زیاتریش دەكات، منداڵەكە دیسانەوە دەڵێ: با ئەو سەگە تێر كەم، بۆ منیش خوا گەورەیە، بۆیـە كـولێرەی سێیەمیشی پێ










دەدات، سەگەکە ئەویش دەخوات، ئینجا هێزی دێتەوەو هەڵدەستێتەوە بە تەندرووستییەکی خۆش لەسەر ڕێی منداڵەکە دوور دەکەوێتەوە.

کابرایەکی خوداناس لەولاوە ئەو منداڵە دەبینێ، پێی دەڵێت: ئەوە تۆ کولێرەکانی خۆت دایە ئەو سەگە، ئەدی خۆت چی دەخۆیت؟!

منداڵەکە دەڵێ: وەڵڵا ئەگەر خودا ڕەحم پێ نەکات، هیچ نابێ بیخۆم، چونکە هەر ژەمەی کولێرەیەکم هەیە، سێ کولێرەکەی ئەو سێ ژەمەی داهاتووشم دایە ئەو سەگە، کەوابێ بۆ خۆم هیچم نەما، بەڵام قەیدی ناکات، ئەگەر خودا پێی باش بێ، لە لایەکی تر ڕزقم بۆ دەنێرێ، ئەگەریش پێی باشبوو، برسی بمێنم، ئەوە دیارە خێری تێدایە، منیش سەبر دەگرم و ئەو پەڕی بڕەك برسی دەبم، دواتر برسییەتییەکەم بەسەر دەچێ و دەگەمەوە کولێران.

کابرای خواناس کە ئەم منداڵە بەو شێوە ئیمانە بەرزە دەبینێ، زۆری خۆش دەوێت، پێی دەڵێت: دە موژدە بێ، دەنا ئەوە خودا دڵی یەکێکی بۆ نەرم کردی و تۆڵەی ئەو کارەتی زۆر بە باشتر بۆت کردەوە.

ئیدی لەگەڵ منداڵەکە دەچێتە لای خاوەنی باغەکە، تکای لێدەکات باغەکەو منداڵەکەشی پێ بفرۆشێ، ئەویش هەردووکیانی









پێ دەفرۆشێت، کابرای خواناس کە ئیتر دەبێتە خاوەنی باغەکەو منداڵەکەش، منداڵەکە ئازاد دەکات و پێی دەڵێت: بڕۆ لە پێناوی خودا تۆ ئازادی و ئیدی کۆیلەی کەس نیت، ئینجا باغەکەشی پێشکەش دەکات و دەڵێت: با ئەو باغەش حەڵاڵی تۆ بێ، ئەوە لە بەرامبەر ئەو ئیمانە بەهێزو دڵە باشەی هەتبوو.

منداڵەکە سوپاسی خودا دەکات و هەتا دەمێنێ سەری سوپاس و بەندایەتیی بۆ خوای گەورە دادەنوێنێ.

## موسڵمانان نمونەی برایەتین

کاتێك ئیبن و عومەر - عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب - (ڕەزای خوایان لێبێ)، گەڕایەوە مەدینە، زانی ئیمامی حوسێن بە خاووخێزانی بەرەو عیراق هاتوون، بۆ وەڵامدانەوەی ئەوانەی داوایان کردووە بچێتە ناویان و بەرگری لێ بکەن، بەڵام دەیزانی ئەوانە ئەو دەستخەڕۆ دەکەن و درۆی لەگەڵدا دەکەن، بۆیە یەکتاو سواری ئەسپەکەی بوودەو بەدوایاندا هات، دوای چەند شەو و ڕۆژێك پێیانگەیشت، هاتە لای حوسێن و سەلامی لێکرد، پێی گوت: بۆ کوێ؟

گوتی: بۆ عیراق.







پێی گوت: داوات لێدەکەم بگەڕێیەوە، چونکە ئەوانە ناپاکیت لەگەڵ دەکەن، لەگەڵ باوکت ڕاستیان نەکرد، چۆن لەگەڵ تۆ ڕاست دەکەن؟!

بەڵام حوسێن هەر سوور بوو، لەسەر بەردەوامبوونی کاروانەکەی بۆ عیراق و نەگەڕانەوەی بۆ مەدینە..

ئیبن و عومەر پێی گوت: بە وەڵڵا خودای گەورە پێغەمبەرایەتی و پاشایەتی بە کەس نادات، پێغەمبەرایەتی بە ئێوەداوە، پاشایەتیتان پێنادات. تکا دەکەم بگەڕێوە.

ئیمامی حوسێن دیسانەوەش هەر لەسەر هەڵوێستی خۆی سووربوو و ڕازی نەبوو بگەڕێتەوە، بۆیە ئیبن و عومەر هیچی بۆ نەمایەوە، ئەوە نەبێ بە گریانەوە ماچی ماڵئاوایی لێکردو پێی گوت: وەڵڵاهی کوژراوێك ماچ دەکەم!! وەڵڵاهی کوژراوێك ماچ دەکەم!!

قسەکەشی ڕاست دەرچوو، ئیمامی حوسێن گەیشتە عیراق و نەگەیشتە عیراق سوپای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد دەورەیان داو ئەوانەی دەعوەتیشیان کردبوو پشتیان تێکرد و گورگان خواردوویان کرد، خۆی و کوڕ و ئامۆزاو ئەوانەی لەگەڵی بوون لە پیاوەکانی، هەموویان بە غەدرو بە ناهەق شەهیدکران.











## موسڵمانان سوپاسی خودا دەکەن

یەك لە پیاوچاکان بە لای پیرەمێردێکی موسڵماندا تێدەپەڕێ، تەماشای دەکات: ئەو پیرەمێردە چاوەکانی کوێرن، دەست و قاچەکانی هەر چواریان شەلەلن، پارچە گۆشتێکە لەوێ کەوتووەو هیچ جولەو هێزێکی نەماوە، ئینجاش سوپاسی خوای گەورە دەکات و بە زمانێکی شیرین، پڕ بە دڵ دەڵێت: الحمد لله الذي عافاني مما ابتلى به كثيرا من الناس وفضلني على كثير ممن خلق تفضيلا..واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی سەلامەتی کردم لەوەی کەوا زۆرێکی خەڵکی پێ موبتەلا بووەو لە زۆرێك لەوانەی چاکەی لەگەڵدا کردوون، چاکەی گەورەتری لەگەڵ مندا کردووە!!

ئەو پیاوچاکە کە ئەم پیرەمێردە بەو شێوەیە دەبینێ، سەیری پێ دێ؟! لێی دەپرسێ: باشە کوا سەلامەتی تۆ لە چیدایە؟! خۆ هیچ شوێنێکی ساغت نییە؟!

پیرە ئیماندارەکە وەڵامی دەداتەوە، پێی دەڵێت: تۆ چۆن شتی وەها دەڵێیت؟! ئەدی ئەوە نییە خوای گەورە دڵێکی ساغی داومەتێ، تا خودای پێ بناسم و هەق و ناهەقی پێ لە یەك جیا بکەمەوە!! ئینجا بێجگە لەوە ئەدی ئەوە نییە، ئەو زمانە ساغەشی داومەتێ، تا سوپاسی خودای پێ بکەم و شایەدی خوایەتی خوداو بەندایەتی خۆمی پێ بدەم!! ئەدی لەوانە زیاتر چی؟! بۆچی تۆ









بەڵاتەوە وایە، ئیماندار دەبێ، چیی لەوانە زیاتری هەبێ؟! تا ببێتە موسڵمان و سوپاسی خوای لەسەر بکات؟!

## موسڵمان دڵنیایە لەوەی:

## هیچ شتێك بەبێئاگایی خودا نابێ

پێشەوای ئیماندار حەسەنی بەننا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، لە دوای داڕوخانی دەسەڵاتی ئیسلامی، لە دەرئەنجامەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، یەك لە پێشەوا هەرە یەکەمەکان بوو، کە هەوڵی هەڵسانەوەی موسڵمانانی داو کۆمەڵەی برایانی موسڵمانی درووست کرد، جموجۆڵی زۆری هەبوو و لە ماوەیەکی کەمدا بە پێی ڕاپۆرتەکان، نیو ملیۆن ئەندامی بۆ درووستبوو، بۆیە ڕۆژئاواو و حکومەتی مەلیك فاروقی ئەڵقە لە گوێی ڕۆژئاواش بەو دەرکەوتنەی ئیمام بەننا ترسی زۆریان لێ نیشت، ئەوە وای کرد، دەزگا سیخوڕی و ئەمنییەکانی میسر چاودێری چالاکییەکانی بکەن، لێرەو لەوێ ئەندامانی برایان هەستیان دەکرد، حکومەت هەڕەشەی زۆری هەیە لە ئیمام بەنناو لەو بڕوایە دان، کارێکی خراپی بەسەر دێنن، بۆیە پێیان گوت:



ـ ئەی ئیمام لەمەولا ئاگاداری خۆت بە؟! ئەوەنـدە بـە گونـد و شـارەکاندا مەگـەڕێ و وتـاری ئیمـانی بـۆ خـەڵکی مـەدە، ئاخـەر حکومەت بە دواتەوەیەو دەترسین شتێکت لێ بکات!!

ئیمام بەننا بە ئیمانێکی پتەو و بە خەنـدەییێکی موسـڵمانانەی پڕ لە بەرائەتەوە وەڵامی دانەوە، پێی گوتن: یانی چی بکەم؟!

گوتیان: ئاگاداری خۆت بەو زۆر دەرمەکەوە!

ئیمام پرسی: گوتتان: ئاگاداری خۆت بـەو زۆر دەرمەکـەوە! .. باشە لەبەر چی؟!

گوتیان: مەبادا حکومەت بتکوژێ..

ئیمام گوتی: جا باشە کامە ڕۆژ ئاگاداری خـۆم بم؟! ئـەو ڕۆژەی قەڵەمی قەدەر نووسیویەتی هیچم لێ نایێ؟! یان ئەو ڕۆژەی قەڵەمی قەدەر نووسیویەتی، فلانە شتم بەسەر دێ؟!

هەموو سەرسام بوون و کەس هیچی نـەگوت؟! ئیمـام درێـژەی پێدایەوە: بەڵێ برایان.. ئـەوەی خـوا نووسـیبێ، هـەر ئـەوەو هـیچ هەڵاتنێکی لێ نییە، ئەوەشی نەینووسیبێ، ئیدی بـۆ لـە خۆمانـەوە لێی بترسین؟! بۆیە لەسەر کۆششی خۆمان بەردەوام دەبـین و ئەوەشـی لە لای خوا هاتووە، خۆش هاتووە!!



## موسڵمانان شێر سیفەتن!

کە ئیمامی شافعی فیقهەکەی خۆی بڵاودەکردەوە، هەندێ کەس هەبوون دژایەتییان دەکرد و قسەی نەشیاویان پێ دەگوت، ئەویش هیچی نەدەگوت و نەیدەهێشت قوتابیەکانیشی هیچ وەڵامێکی ئەو ناحاڵییانە بدەنەوە، قوتابیەکانی ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، دەیانگوت: ئەی ئیمام تۆ بۆچی وەڵامی ئەوانە نادەیتەوە؟! ئەی بۆچی ناهێڵی ئێمە وەڵامێکیان بدەینەوە؟!

ئیمام پێی دەگوتن: براکانم.. ئێوە شێر سیفەت بن، نەك سەگ سیفەت!! ئەگەر بێت و سەگ چاوی بە نێچیرێك بکەوێ، لە دوورەوە چاوی تێدەبڕێ و بە حەپە حەپ سەری لە دوو دەنێ، بەوە نێچیرەکە وشیار دەبتەوەو لەبەر دەستی هەڵدێ، ئیدی سەگەکە قەت ئەو نێچیرەی بۆ ناگیرێ؟!! بەڵام شێر بە پێچەوانەی سەگەکە دەکات، ئەگەر چاوی بە نێچیرێك بکەوێ، لە دوورەوە لەبەر چاوی دەگرێ، بە هێمنی و ئارامی بەرەو نێچیرەکە دەچێ، تا دەیخاتە مەودای بازی خۆی، ئەوسا بە ئاسانی بازێکی بۆ دەبات و دەیگرێ؟!

## موسڵمان زانستیان بەلاوە گرنگترە!

دەگێڕنەوە قازی یوسف لە ئەڵقەی دەرسێك بوو لە لای ئیمام ئەبی حەنیفە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ)، هەواڵیان بۆ هێنا: دایکت کۆچی دوایی کرد؟!









گوتی: بە ڕاستتانە؟!

گوتیان: بەڵێ!

گوتی: یانی تەواو بووەو ئیتر دەبێ بینێژین؟!

گوتیان بەڵێ، تەواوبووەو کفن و دفن کراوە، چاوەڕوانی بەڕێزتانین بێن، بیبەینە گۆڕستان.

ئەبو یوسف گوتی: کەوابێ ﴿انا لله وانا أليه راجعون﴾.. دە برایان مادام وایە، تازە من بێم و نێم، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕم، بۆیە با فلان لە وەکیلی من لەگەڵتان بێت بینێژێ، من جارێ لێرە دەبم، با دەرسکەم نەچێ؟!

## موسڵمانان لێبووردەن

شەوێکیان ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی پێنجەمی پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بۆ نوێژکردن، درەنگانی شەو دەچێتە مزگەوت، لە مزگەوتدا خەڵکێکی ڕێبوار خەوتوون، بەڵام زۆر تاریك دەبێت و خەلیفە نازانێ کەسی لە پێشدا هەیە، یان نا؟! بۆیە کە هەنگاو دەنێ بۆ ناوەوەی مزگەوت، پێی بە ورگی یەك لە ڕێبوارە خەوتووەکان دەکەوێ، کابرا کەمێ ئێشی پێ دەگات و لە خەوەکەی ڕادەپەڕێت، دەڵێت: ئەوە چ کەرێك بوو؟!







ئەو هاوڕێیەی لەگەڵ خەلیفەیە دەیەوێت لە پیاوەکە نزیک بێتەوەو هیچ نەبێت سەرکۆنەی بکات، کە ئەمە خەلیفەیە پێی بەر ورگت کەوت، ئیتر تۆ چۆن بێ ئەدەبی وەهادەکەیت؟! بەڵام خەلیفە ڕێ لەو هاوڕێیەی دەگرێت، کە ئەزیەتی ئەو پیاوە بدات و پێی دەڵێت: وازی لێبێنە برا، من پێم لە ورگی ناوە، ئێشی پێگەشتووەو بە شڵەژاوی ڕاپەڕیوە، دوای ئەوە تەنها پرسیارێکی کردووە، گوتوویەتی: ئەرێ ئەوەی پێی پێ نام، مرۆڤە؟ یان کەرە؟! ئیدی خۆ هیچی دیی نەگوتووە فەقیرەی، بۆ لێی توڕە دەبی؟! بۆیە منیش ڕوو لەو برایەی خۆم دەکەم و وەڵامی دەدەمەوە، دەڵێم:

نەخێر برای ئازیزم! ئەوەی پێی لێ نای، کەر نەبوو، بەڵکو مرۆڤێك بوو، ئەویش نەیزانی تۆ لە پێشیدای بۆیە وەهای کرد؟! جا ئەگەر دەتەوێت عەفوی بکەو ئەگەریش دەتەوێت، بفەرموو من لە پێشتدا درێژدەبم و تۆ وەرە پێیێکم لە ورگ بدەو تۆڵەی خۆت بکەوە!

بەمە کابرا شکی کرد، ئەوەی لە پێشیدایە کەسێکی ئاسایی نییە! زانی لەگەڵ کێ وەستاوەو کێیە بەو خاکییە قسەی لەگەڵدا دەکات، بۆیە عەفوی کردو داوای لێبووردنی لە خەلیفە کرد، گەلێکیش سوپاسی خوای گەورەی کرد، کە ئەو دینە پاکەی پێ بەخشیون، دینێك کە خەلیفەی وەکو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دادگر و خاکی درووست دەکات!!!









ئیتر تا لە دونیاش ما، ئەو ڕووداوەی دەگێڕایەوەو بە هۆیەوەی خەڵکی بەردو ئیسلام بانگ دەکرد، ئیسلامێك، کە ئاینی ژیان و خۆشەویستییەو خەلیفەی وەها خاکی و هەقخواز و دادپەروەری هەیە!!

## موسڵمانان خێرو خۆشیی مرۆڤایەتییان دەوێ!

کە سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە بەندیخانەدا بوو، ئازاری جۆراوجۆریان دەدا، یەك لە ڕۆژەکان هەموو سنوورێکیان شکاند، هەوایان تێ کردبوو و زکیان کردبووە دەهۆڵ، لێیان دەدا، بەوە زۆر نارەحەتیان کردبوو، تەنانەت یەك لەو جەللادانەی ئازاریشی دەدا، بێزار ببوو، دواتر کە سەید هاتبۆوە خۆ، هاتبووە لای و پێی گوتبوو:

- گەردنم ئازاد بکە، من فەرمانبەرم و ئەوەی پێیان کردم، بە دڵی خۆم نەبوو!!

سەید قوتب بە دڵی پاکی خۆی پێی گوتبوو:

- گوێی مەدەرێ!! ئێمە خێر و خۆشیمان بۆ مرۆڤایەتی دەوێ، با ئینجا مرۆڤایەتیش نەماننناسن و هەر چەندەی دەیانەوێ ئازارمان بدات!!







## لە سکاڵای ژنێکی هەژار دەکۆڵتەوە!

ئـەمیری ئیمانـداران و خەلیفـەی پێنجـەم عومـەری کـوڕی عەبدولعەزیز وەکو خەلیفەکانی ڕاشیدینی پێشە خـۆی، دەرگـای بـۆ هەمووان واڵا بوو و هەموو تاکێکی وڵاتـی ئیسـلامی دەیتـوانی بـە خۆی، یان بە نامەیێکی بگاتە لای ئـەو خەلیفـە بـەڕێزەو شـەکوای حاڵی خۆی لەلا بکات.

جارێکیان بەریدی میسر بـۆ خەلیفـە هـات، تیایـدا نامـەیێك هەبوو، لە لایەن پیرەژنێکەوە نووسرابوو، بە ناوی (فەڕتونـەی ڕەشـی مەولای زی ئەسبەح)، تیایدا نووسیویەتی:

ئەی ئەمیری ئیمانداران.. دیواری حەوشـەی خانووەکـەم نزمـە، دەکرێ بە ئاسانی بەسەریدا بازبدرێتە ژوور و مریشکەکانم بـدزرێت!! تکا دەکەم، ئەو دیوارەم بۆ چاکبکەیت!!

خەلیفە کە ئەو نامەیـەی خوێنـدەوە، هـەقی بـەو پیرەژنـە دا، وەڵامی خۆی لە نامەیێکدا بۆ فەڕتونە ناردەوەو تیایدا نووسی:

بسم الله الرحمن الرحیم.. لە بەنـدەی خـودا عومـەری ئـەمیری ئیماندارانەوە بۆ فەڕتونەی ڕەشی مەولای زی ئەسبەح..

دوای ئەمە:





نامەکەی تۆم پێ گەیشت، کە تیات نووسیوە، دیواری حەوشەکەت نزمەو بەسەریدا بازدەدەنە نێو ماڵت و مریشکەکانت دەدزن، بۆیە منیش نووسراوێکم بۆ (ئەیووبی کوڕی شورەحبیل) نووسیوە، تیایدا فرمانم پێکردووە، دیوارەکەت بەو شێوەیە بۆ بەرزبکاتەوە، تاوەکو لەوەی لێی دەترسیت، بە پشتیوانی خودا بتپارێزێ و وەسسەلام.

لە نامەکەیشی بۆ ئەییوبی کوڕی شورەحبیلی والی خۆی بەسەر میسرەوە، خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لێ بێ) نووسیبووی:

لە بەندەی خودا عومەری ئەمیری ئیماندارانەوە بۆ کوڕی شورەحبیل، لە دواییدا:

فەڕتونەی ڕەشی مەولای زی ئەسبەح نامەیەکی بۆ نوسیوم، تیادا دەڵێت: دیواری حەوشەی خانووەکەم نزمە، دەکرێ بە ئاسانی بەسەریدا بازبدرێتە ژوور و مریشکەکانم بدزرێت!! بۆیە داوای کردوە ئەو دیوارەی بۆ چاکبکەین. جا ئەگەر ئەو نووسراوەی منت پێ گەیشت، تۆ خۆت سواری وڵاغەکەت بەو بە دەمیەوە بچۆ، بۆ ئەوەی دیوارەکەی بۆ چاك بکەیت!

ئەو نووسراوە گەیشتە شورەحبیل، دەستبەجێ سواری وڵاغەکەی بوو و بەرەو (جیزە) هات، کەوتە پرسیار کردن لە فەڕتونە، تا



دۆزییەوە، بینی پیرەژنێکی ڕەشی هەژارە، نامەکەی ئەمیری ئیماندارانی بۆ خوێندەوە، کە لەسەر داوای ئەو چی بۆ شورحەبیلی والیی نووسیوە، دوای ئەوە دیوارەکەی بۆ بەرزکردەوە، بەو شێوەیەی نەکرێ بەسەریدا بازبدرێ و چیدیکە مریشکەکانی نەدزرێت، ئینجا فەرتونەی جێهێشت و گەڕایەوە سەر کاروبارەکانی خۆی.

## موسڵمان نابێ درۆ بکات

موسڵمان نابێ درۆ بکات و دەبێ هەمیشە بە ڕاستی و بە ئاقڵییەوە قسە بکەن، دەگێڕنەوە: ئیبراهیمی نەخعی کاتێک میوانێکی بهاتبووایە، حەزی نەکردبووایە پێشوازی بکات، نەیدەگوت: بڵێن لە ماڵ نییە، چونکە دەیزانی ئەمە دەبتە درۆ و شتێکی حەرامە!! نەشی دەگوت: بڵێ: نایەوێ بتبینێ، چونکە حەزی نەدەکرد، بەو شێوەیەش دڵی میوانەکە بریندار بێ و بشکێتەوە، بۆیە بە غوڵامەکانی دەگوت: پێی بڵێ:دواتر لە مزگەوتدا ببیبینە!! بەڵام وشیار بە، نەڵێی: لێرە نییە!! چونکە ئەوە دەبتە درۆ!!













١ـ دەڵێن: یەکێ لە زاناکان کابرایەکی بینی، زۆری قسە دەکرد و کەم بێدەنگ دەبوو، ئەویش بە نەرمی ئامۆژگاری کرد و پێی گوت: برای خۆم.. تۆ دوو گوێت پێ دراوەو یەك زمان، ئەمە بۆ ئەوەیە دوو ئەوەندەی قسە دەکەی، ببیسی، نەوەك بە پێچەوانەوە ئەوەی دەیڵێی دوو هێندەی ئەوە بێ، کە دەیبیسی؟!

٢ـ پیاوێك هاتە لای عەمڕوی کوڕی عوبەید، پێی گوت:

ـ ئەی عمڕوی کوڕی عوبەید.. ئەسواری تا ئێستاش لەنێو بەسەرهاتەکانی باسی تۆ دەکات.

عەمڕو پێی گوت: ئەی پیاو تۆ هەقی دانیشتن لەگەڵ ئەوت نەپاراستووە، کاتێك هاتیە لای من و قسەی ئەوت بۆ من گواستەوە؟! هەقی منیشت نەپاراستووە، کاتێك دێیە لام و هەواڵی خراپی حاڵی برایەکم پێدەدەی؟!

بەڵام هەق وا بوو کە ئەو قسانەت لێی بیست و پێت ناهەق بوو، هەر ئەوسا پێی بڵێی: مردن دەگاتە هەمووومان، گۆڕیش هەمووومان دەگرێتە خۆ، ڕۆژی قیامەتیش هەمووومان کۆدەکاتەوە، خوای گەورەش خۆی حوکم لە نێوانماندا دەکات، کە خودا خۆی باشترین حاکمە.







## موسڵمانان شەرم لە خودا دەکەن

حاتەمی ئەصەم بە یەکێ لە قوتابییەکانی دەڵێت: ئەگەر یەکێك چاکەیەکی لەگەڵت کردبێ، کاتێك لە لای دادەنیشی، شەرمی لێدەکەیت!! بەڵام بەردەوام قسەو کردەوەکانت بۆ خوای گەورە بەرزدەبنەوە (کە خاوەنی تەواوی چاکە گەورەکانە بەسەر بەندەکانیەوەی)، ئینجاش شەرم لە خودات ناکەی؟!

## موسڵمانان گەردنی یەك ئازاد دەکەن

عەبدوڵڵای کوڕی محەمەدی کوڕی زیاد دەگێڕێتەوە، دەڵێت: من لە لای زانا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بووم، پیاوێك هاتە لای، پێی گوت: ئەی باوکی عەبدوڵڵا.. من غەیبەتی تۆم کردووە، داوای عەفو دەکەم و گەردنم ئازاد بکە.

ئەحمدی کوڕی حەنبەل پێی گوت: ئەگەر دووبارەی نەکەیەوە، ئەوە گەردنت ئازاد بێ.

منیش پێم سەیر بوو؟! پێم گوت: ئەوە ئەی باوکی عەبدوڵڵا.. ئەو غەیبەتی تۆ دەکات و تۆش بەو ئاسانییە گەردنی ئازاد دەکەی؟!

وەڵامی دامەوە، گوتی: ئەدی پێم نەگوت: بەو مەرجەی نەگەڕێیەوە سەر غەیبەتەکەت و جارێکی دی دووبارەی نەکەیەوە!!









گوتم: یانی هەر ئەوەندەیە؟!

گوتی: ئەدی چی؟! ئەویش موسڵمانە بە هەڵەچووە، کە غەیبەتی کەسێکی کردووە، کە مامۆستایەتی و وەکو خۆی موسڵمانەو برای ئیمانییەتی، بەڵام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەوە تێك ناچێ، ئەوەی بەلاوەی گرنگە، ئەو برا ئیمانییەی، جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر غەیبەتکردن، ئەوەش بۆ ئەوەی لەو گوناهە خراپە ڕزگاری ببێ، ئینجا ئەویش لە زمانی ئەو برایەی ڕزگاری ببێ، نەوەك لەبەر خۆی بێ و بەوە تێکبچێ، کە غەیبەت کراوە!!

واتە:ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، بەرژەوەندی ئیمانی برا ئیمانییەکەی، لە پێش بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دانا، هەرچەندە غەیبەتییان کردووەو ناشرینیان کردووە!!

## موسڵمانان خۆیان فێری دین دەکەن

بە هامان شێوەی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، پیاوانێك دێنە لای (ئیبن و سیرین)، پێی دەڵێن: ئێمە باسی تۆمان بە خراپ کردووە، داوای عەفو دەکەین و گەردنمان ئازاد بکە.

بەڵام (ئیبن و سیرین) گەردنی ئازاد نەکردن و پێی گوتن: من لە شتێك ئازادتان ناکەم، کە خوای گەورە حەرامی کردووە.







واتە: ئیبن و سیرین ویستی بە ئاسانی عەفویان نەکات، نەوەکو لێیان خۆش دابێ و ئەوەی عەقڵیان نەیگرت، غەیبەتی بکەن و بە خراپ باسی بکەن، ئاخەر بەوە ژیان ناخۆش دەبێت و دونیا تێك دەچێ!! بۆیە بەرەو تۆبەو ئیستیغفاری بردن و ویستی بە دڵ پەشیمان ببنەوەو لە خوا بپاڕێنەوە، عەفوییان بکات، تا بەمە پاکببنەوەو جارێکی تر نەگەڕێنەوە سەر غەیبەت و تاوان کردن و بە خراپ ناشرینکردنی خوشك و برا موسڵمانەکانیان.

## موسڵمانان گومانی باش بە یەکتری دەبەن

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بە (سوفیانی سەوری)م گوت: ئەی باوکی عەبدوڵڵا.. وای کە ئەبوحەنیفە لە غەیبەت دوورە!! قەت لێم نەبیستووە غەیبەتی دوژمنێکی خۆی بکات؟!

سوفیانی سەوری وەڵامی دامەوە، گوتی: ئەو ئاقڵترە لەوەی شتێکی وەها بکات، خێرەکانی خۆی بدۆڕێنێ.









## موسڵمانان ئازاری کەس نادەن

تـەوقی کـوڕی مونەببیـە دەگێڕێتـەوە، دەڵێـت: چـوومە لای محەمەدی کوڕی سیرین.. بەر لەوەی قسە بکەم، پێی گوتم: وا هەست دەکەم، بە دەست شتێکەوە دەناڵێنی؟!

پێم گوت: بەڵێ.. من نەخۆشم، بۆ لای کێ بچم؟!

پێـی گـوتم: بـڕۆ لای فلانـە پزیشـکی، ئـەو باشـە، باسـی نەخۆشیەکەی خۆتی بۆ بکە، تا دەرمانـت پـێ بـدات.. دوای ئـەوە، یەکسەر ڕای خۆی گۆڕی و گوتی: نا، نا، بووەستە.. بـڕۆ لای فلانـە پزیشکی، ئەویان باشترە!!

بەڵام پاش ئەوەش بێتاقەت بوو و پڕ بە دڵ گوتی: خوایە تۆبە.. خوایە ببەخشە.. ئەستەغفیرەڵڵا...

گوتم: چی بوو؟!

گـوتی: وا هەسـت دەکـەم خراپـە و ناهـەقیم سـەبارەت بـە پزیشکەکەی یەکەم کرد؟! غەیبەتیم کرد، نەدەبوو وا بکەم؟!

## موسڵمانان بڕوا بە هەموو شتێك ناکەن

کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بـێ) ئـەمیر بوو، پیاوێك هاتە لای، پێی گوت: بیستوومە فلانـە کـەس هاتۆتـە لای تۆو غەیبەتی منی کردووە!! گوتوویەتی: من لە پـاش ملە بـە









خراپە باسی تۆم کردووە!! جا هاتوومە پێم بڵێی چی گوتووە؟! هەتا بانگی بکەم و درۆکانی سپی بکەمەوە؟!

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) بە هێمنییەوە پێی گوت: ئەوە تۆ دەڵێی چی برا؟! سەرەتا: من حەز ناکەم بە زمانی خۆم جوێن بە خۆم بدەم.. دوای ئەوە پێم وابێ بڕوام بەو پیاوە نەکردووە!! سێیەمیش: خۆت ئاگاداری بەو قسانە پەیوەندیم لەگەڵ تۆش تێکنەداوە.

واتە: (براکەم.. خۆ من لەبەر قسەی ئەو پیاوە، بە چاوی خراپ تەماشی تۆم نەکردووە.. ئیدی چ پەیوەندیت بەو پیاوە هەیەو لێ دەتەوێ شتەکانی ئەوت بۆ بگێڕمەوە؟! ئێ ئەو خراپ بوو، تۆ باش بە)!!!

بەوەش کابرا ئامۆژگاری خۆی وەردەگرێ و دڵی لەبەر ئیمان و خۆشەویستی، جێگەی ڕقهەڵگرتنی لەو برایەی غەیبەتی کردبوو، تیا نامێنێتەوە، بەوەش خۆیشی لە ئاگری ڕق و ناحەزی ڕزگاری دەبێ و خۆیشی و براکەشی سەلامەت و ئاسوودەو ئارام دەژین!!









## موسڵمانان ڕێزی مامۆستا دەزانن



١ـ (عومەری کوڕی خەتاب) خەلیفەو ئەمیری ئیمانداران، بەو پایە بەرزیەی هەشیبوو، دەیگوت: ((ئەوەی حەرفێکی فێر کردم، کردمیە کۆیلەی خۆی)).

٢ـ مەلا (گۆرانی شارەزووری) مامۆستای سوڵتان (محەمەدی فاتیح)یش، کاتێك دەبینێ محەمەد لە سەرەتاوە گرنگی بە خوێندنەکەی نادات و قورئانەکەی بە باشی ئەزبەر ناکات، دارێکی بەو دارەی دەستی لێ دەدات؟! کە محەمەد و کەسیش چاوەڕێی ئەوە نەبوون، بەڵام دوای ئەوە محەمەد نەك ڕقی لێهەڵناگرێ، بەڵکو زۆر بە باشی دەبتە قوتابی و هەتا دەشمرێ هەر ڕێزی ئەو مامۆستایەی دەگرێ و هەر خۆی بە بچووك و خزمەتکاری ئەو مامۆستا زانایەی دەزانێ!!

٣ـ ئەحمەد شەوقی شاعیریش دەڵێ:

قم للمعلم وفیه التبجیلا

کاد المعلم أن یکون رسولا

واتە:

لەبەر مامۆستاکەت هەلسەودو ڕێزی بگرە

خۆ مامۆستا خەریکە لە پایەی پێغەمبەر نزیکدەبێتەوە









مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان شورەیحی قازی و ئیمامی شەعبی پێکگەیشتن، ئیمامی شەعبی لە حاڵ و وەزعی پرسی؟

شورەیح وەڵامی دایەوە: ئەوە بیست دانە ساڵە لەگەڵ خێزانەکەمم و شتێکم لێی نەبینیوە توڕەم بکات!!

ئیمامی شەعبی سەیری پێ هات؟! پرسی: ئەمە چۆن؟!

شورەیح وەڵامی دایەوە: لە یەکەم شەودا کە گەیشتمە لای خێزانەکەم، بینیم باشیەکی ناوازەو جوانییەکی لە ڕادە بەدەری هەیە!! بۆیە لە دڵی خۆمدا گوتم: دوو ڕکعات نوێژی شوکر و سوپاسم بۆ خوای گەورە بە سوننەت دەکەم!

دەستم بە نوێژەکە کرد، کە سەلامم دایەوە، بینیم خێزانەکەشم وەکو من هەمان نوێژی کردووەو ئەویش وا سەلام دەداتەوە!!

ئیدی چاوەڕێم کرد، تا میوانەکان ڕۆیشتن و هەر من و ئەو لە ماڵەکە ماینەوە، لێی نزیکبوومەوەو دەستم بۆی درێژکرد، پێی گوتم: باوکی ئومەییە جارێ لە شوێنی خۆت بووەستە.

دواى ئەوە گوتی: بێگومان سوپاسی ڕاستەقینە بۆ خوایەو من سوپاسی دەکەم، هەروەها بە تەنیا داوای یارمەتی لە ئەو دەکەم، ئینجا درودو سڵاو بۆ سەر موحەمەدو ئاڵ و بەیتی دەنێرم .. دوای





ئەوە: من ژنێکی غەریبەم، نازانم خوڕەوشتی تۆ چۆنە؟! بۆیە ئەوەم بۆ ڕوونبکەوە، کە حەزی پێدەکەی، تا بیکەم و ئەوەشم بۆ ڕوونبکەوە، کە ڕقت لێیەتی، با وازی لێبێنم!!

دوای ئەوە، گوتی: لە خزمانی تۆ، هی وا هەبوون هاوشانی تۆ بوون، لە خزمانی منیش هی وەها هەبوون هاوشانی من بوون، بەڵام دیارە هەر ئەو شتە دەگاتە سەر، کە خودای گەورە مەبەستیەتی!! ئیدی ئەوا بوومە خێزانی تۆ، دەی تۆش ئەوە بکە، کە خودا ئەمری پێ فەرمووی، یان ئەوەتا بە باشی لەلای خۆتم بهێڵەوەو یان ئەوەتا بە چاکی دەستم لێ بەردە!!

من ئەو قسانەم دەکەم و لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە لە گوناهەکانی من و گوناهەکانی تۆش خۆش ببێت.

شورەیح درێژەی داو گوتی: لە ڕاستیدا ئەی شەعبی، لەو بابەتەوە، ئەو خوتبەیە بۆ من زۆر پێویست بوو!! بۆیە منیش گوتم:

بێگومان سوپاسی ڕاستەقینە بۆ خوایەو من سوپاسی دەکەم، هەروەها بە تەنیا داوای یارمەتی لە ئەو دەکەم، ئینجا درودو سڵاو بۆ سەر پێغەمبەر و ئال و بەیتی دەنێرم .. دوای ئەوە: لە ڕاستیدا تۆ قسەیەکت کرد، ئەگەر وەهابی وەکو گوتت، ئەوە لای من بەختەوەر دەبی، ئەگەریش هەر پڕوپاگەندە بێ و ڕاست نەکەی، ئەوا ئەو قسانەت دەبنە بەڵگە لە سەرت!! من حەزم لەمەو لەوەیە، ئەمەو









ئەوەشم پێ ناخۆشە، ئیدی ئەگەر چاکەیەکت دیت بڵاویبکەوەو ئەگەر خراپەیەکیشت دیت، بیشاردەوە.

گوتی: ئەی چۆن سەردانی خزمەکانم دەکەی؟

گوتم: بەو شێوەیەی پێویستەو زیاد لەوە نەبێ، بگاتە ئەوەی بێ زەحمەتم بکات.

گوتی: ئەدی لە هاوسێکانت!! حەزت بە ڕەفاقەتی کێیە؟! ڕێگەیان بدەم بێنە ماڵەکەت و کێشت خۆش ناوێ، تا نەهێڵم دلتوچۆمان بکەن؟!

گوتم: منداڵەکانی فلان خەڵکێکی باشن و منداڵەکانی فلان خەڵکێکی خراپن!

شورەیح گوتی: ئیدی بەم شێوەیە ئەوە بیست ساڵە لەگەڵ ئەو ژنەم دەژیم، لە هیچ شتێکیا گلەییم لێی نەبووە، تەنیا جارێکیان نەبێ جارێك لێی توڕە بوویمە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جارەش من ستەمم لێکردووە، دەنا ئەو عەیبی نەبووە!!

### باس و بەیانی پیاوی موسڵمان و چۆنیەتی دونیای بێ وەفا

موسڵمان ئادەمیزادێکە خاوەن دین و ئیمانە

پیاوی پڕ لە نور و پاك و پیرۆز و بە ویجدانە






به هۆش و هەستی زاناو زیرەك و دڵ پاك و بێگەردە
لە کردەی چاك و پێویستی ژیانا تا بڵێی مەردە
لە دونیای دون ئەپارێزێ هەموو دەم دین و ئیمانی
بە گوێرەی شەرعی پڕ نور و بە پێی ئایاتی قورئانی
ئەزانێ عومری کورتە لە جیهان مومکین نییە مانی
ئەجەل کاتێ کە هێرش دێنێ بێشك نییە ئامانی
نییە چارەو نەجاتی ئەو ژیانی لێ ئەشێوێنێ
بە تین و تاو وەکو شێرێکی برسی تێکی ئەشکێنێ
بە زەبری دەست و پەنجەی تیژی ڕیشەی جەرگی ئەپسێنێ
مەجال و ماوە نادا یەك دەقیقە گیانی دەردێنێ
موسڵمان لەو جیهانە ماوەیەك ئەژیێ بە میوانی
بە ژینێکی کولە مەرگی و پەرێشانی و هەراسانی
لە سجن و بەندیخانەی پڕ خەم و ماتەم کە دونیایە
کەوا هەردەم پڕی هۆسەو هەراو هاوار و غەوغایە
لەلایێ شین و گریانە، لەلایێ بەزم و سەیرانە
لە هەر لا کوشتن و خوێنڕشتن و قەتلی هەزارانە
بە کورتی ئەمەیە دونیا بەشەر پێی هەڵخەڵەتاوە!
ژیانی ژانە، شەکراوی قوڕ و چڵپاوە، ژەهراوە
موسڵمان دینی خۆی نادا بە دونیای بێ وەفای فانی
بە دونیاییێکی عادی پڕ فەسادی پیسی نەفسانی





به گەنج و گەوهەر و زێڕی، به موڵك و ماڵ و سامانی
به ئەرز و باغ و بوستانی، به دەغل و دان و خەرمانی
به کەیف و سەیف و سەیرانی، به شایی و بەزمی لاوانی
به بۆنی عەتر و ڕەیحان و گوڵ و گوڵزاری باغانی
به خانوی خانەدانانی به تاج و تەختی شاهانی
به قەصر و بارەگاو کۆشك و تەلاری بەرزی سوڵتانی
موسڵمانی تەواو هەردەم له دونیا دڵی غەمگینه
له کاری بەدڕەوشتی ئەهلی دونیا جەرگی پڕ خوێنه
هەموو دەم لەو جیهانه کار و پیشەی گریەو و شینه
له خوا داوا ئەکا بمرێ دەسا ڕزگار بی لەو ژینه
له دونیایەکی ئەوتۆ پڕ له حیقد و له ڕق و کینه
له بۆ خزمەت ڕەسولولڵا، که ناوی پاکی یاسینه
موسڵمانی تەواو و خواپەرست پێویسته ئاوا بێ
له ناو گشت کۆمەڵانی گەل بڵند و بەرز و باڵا بێ
موسڵمانێکی پڕ نور بێ، به وێنەی دووڕی لالا بێ
سوڕەییا بێ، چرا بێ، کەوکەبی نوری تەجەللا بێ
گڵۆپی کەهرەبی مزگەوت و میحراب و موصەڵڵا بێ
شوعاع و شەوق و پڕشنگی لەسەر عەرشی موعەللا بێ
به ڕۆژ و شەو هەموو کاتێ موتیعی ئەمری مەولا بێ
له ڕیزی ئەولیا بێ، خۆشەویستی شاهی لەولا بێ









لە نێو ئەهلی جیهانا ڕەنگی شیرینی نەگەچلا بێ
موحببی سەیید و دەروێش و صۆفی و شێخ و موللا بێ
موسڵمانێکی ڕووخۆش و مونەووەر بێ و موعەتتەر بێ
وتاری شەهد و شەککەر بێ، بە وێنەی ئاوی کەوسەر بێ
براو پشتی جەماوەر بێ، دلێر و یار و دولبەر بێ
سەرۆك و سێبەر و سایەو سەر و سەردار و سەروەر بێ
لە مەیدانی حەق و ڕاستی پیاوێکی بە جەوهەر بێ
حقوق زانێکی عادل بێ، بە کورتی حەق ستێنەر بێ
لە بۆ دینی موبین هەردەم قەڵات و قەسر و سەنگەر بێ
موعین و چارەساز و دەستگیر و یاریدەدەر بێ
لە کۆتایی ئەڵێم و پڕ بە دەم هاوار ئەکەم کاکە
هەتا گیانت لەبەر ماوە لەسەر ئەم ئەرز و ئەو خاکە
بەسە ئەنوەر ئەوا عومرت نەما، چوو، پشت لە دونیا کە
هەتا ماوی براکەی دین لەمەودوا ڕوو لە مەولا کە
لە پێش مەرگت ڕەوانی کە زەخیرەو زاد لە دونیادا
لە ڕۆژی حەشر و نەشرا شین و گریان فائیدەی نادا
هەتا لەو ڕۆژە ناخۆشە بە ئاسانی نەجاتت بێ
لە ڕەحمی خوا ئەبێ مەئیوس نەبی و سەبر و سوباتت بێ
بە هۆی زاد و زەخیرەی خۆت لە ڕۆژی (فەزەعول ئەکبەر)
هەتا بتوانی ڕزگار بی بە هەوڵی شافیعی مەحشەر









به هەوڵ و هیممەتی بەرزی بەڕێزی سەییدی سەروەر
بە ڕەحم و شەفقەت و لوتفی جەنابی خالقی ئەکبەر
بە کورتی کاکە تا لەو ڕۆژە لێت خۆش بێ و عەفوت کا خوا
بە ئەمری زاتی پاکی ئەو بچیتە (جەننەتولمەئوا)

## موسڵمانان خۆشییان بۆ هەموان دەوێ

عەبدوڵڵای کوڕی عومـەر (ڕەزای خـوای لـێبێ)، بازرگـانێکی گەورە بوو و لەم ڕێگەیەوە زۆر دەوڵەمەنـد بـوو، کەچـی ئـەو پـارەو سامانەی خودا لەم ڕێگەیەوە پێی دەدا، ئەو بۆ خێر و چاکەی خـەرج دەکرد و بەسەر موسڵمانە هەژار و پێویستەکانی دابەش دەکرد، قەت وەی نەدەکرد، خۆی تێربێ و لە نێو ناز و نیعمەت و خۆشی گـەورەدا بێ و خوشك و برا موسڵمانەکانی هەژار و برسی بن، بۆیە زۆر جـار، کە قازانجێکی دەکرد، شەو نەدەخەوت، هـەتا ئـەو پارەیـەی هـەموو بەسەر هەژاراندا دابەشنەکردبووایەو دڵـی هـەموانی بـەو پارەیـەی خودا پێی داوە خۆش نەکات.

ئەیوبی کوڕی وائیلی ڕاسبی دەگێڕێتەوە، دەڵێت: مـن ئاگـادار بووم، لە ڕۆژێکدا عەبدوڵڵای کوڕی عومـەر (ڕەزای خوایـان لـێبێ)، چوار هەزار درهەمی قازانج کرد، کەچی بۆ بەیانی، بینیم لە بـازاڕەو بە قەرز ئالیك بۆ ئەسپەکەی دەکڕێ!! منیش ئەوەم بەلاوە زۆر سـەیر









بوو، بۆیە چوومە ماڵی عەبدوڵڵا و پرسیارم کرد، ئەوە لەبەر چی؟! خۆ دوێنێ بەبەر چاوی منەوە چوار هەزار درهەمی قازانج کرد، ئەدی ئێستا هۆی چییە بە قەرز ئالیك بۆ ئەسپەکەی دەکڕێ؟!

خانەوادەکەی پێیان گوتم: ئەوەی تۆ دەیڵێی ڕاستە، بەڵام عەبدوڵڵای باوکمان دوێنێ شەو پارەکەی برد و نەگەڕایەوە ماڵ، هەتا بەو شەوە ئەو پارەیەی هەر هەموو لە پێناوی خوادا بەسەر هەژارانی ئەو شارەدا دابەش کرد!!

بەمە وائیل سەری سوڕماو دەستی خستە نێو دەستی و هاتە نێو بازاڕی، بانگی بازرگانەکانی کرد و هاواری کرد: ئەی بازرگانینە، ئێوە چی لە دونیا دەکەن؟! ئەوەتا کوڕەکەی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوایان لێبێ)، لە ڕۆژێکدا بە هەزاران درهەمی بۆ دێت و ئەو بۆ خۆی درهەمێ گلناداتەوە، هەمووی بەسەر هەژاراندا دابەش دەکات، بەیانی بۆ کڕینی ئالیکی ئەسپەکەی، دێتە بازاڕ و بە قەرز ئالیکەکە دەکڕێ!!

## موسڵمان نابێ هەژاران لەبیر بکەن

عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوایان لێبێ)، جارێکیان بینی، کوڕەکانی دەعوەتیان کردووە، دەوڵەمەندەکانیان بانگکردووەو کەسێکی هەژاریان بانگ نەکردووە!! پێی گوتن: ((ئەوە ئێوە تێرەکان بانگ دەکەن و برسییەکان بە برسییەتی دێڵنەوە))؟!







واتـە: کوڕەکـانم نـابێ شـتی وەهـا بکـەن، ئێـوە موسـڵمانن، موسڵمانیش لە هیچ کاتێکدا خودا لەبیر ناکات و ئـەوەی خـوا پێـی خۆشە، هەر ئەوە دەکات!! دەی کەوابێ چۆن ڕەوایە فلانـە هـەژارتان بۆ سەر سفرەکەتان ـ کـە نیعمـەتی خوایـە ـ بانگنـەکردووەو ئـەو هەموو دەوڵەمەندەتان بانگکردووە؟!

## موسڵمانان دەستپێشخەر و بە متمانەن بەخۆیان!!

حوزەیفەی کـوڕی یـەمان (ڕەزای خـوای لـێبێ)، دەگێڕێتـەوە، دەڵێ: کە لە غەزوەی خەندەق بووین، پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) بانگی کردم و پێێ فەرمووم: (( بڕۆ ناو سەربازگەی قوڕەیش، بزانە چی دەکەن))؟

منیش ڕۆشتم، چوومە نێـو ئـەوان، (بایـەکی هێنـدە بـەهێزی دەهات، نەیدەهێشت، کەس کەس بناسـتەوە)!! ئەبوسـوفیان گـوتی: ئەی قوڕەیشییەکان.. با هەر یەکەتان تەماشای هاوڕێیەکـەی تـەکی بکات و بزانێ لەگەڵ کێ دانیشـتووە!! (چـونکە دەترسـێن بێگانـەو جاسوسمان هاتبێتە ناو).

حوزەیفە دەڵێ: ئیدی من یەکسەر قۆڵی هاوڕێکەی تەکە خـۆمم گرت، لێم پرسی: تۆ کێی ئەی پیاو؟





پیاوەکە بە شڵەژاوییەوە گوتی: من فلانی کوڕی فلانم!

تێبینی: ئەم هەقایەتە ڕاستەقینەیە، ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە: ئادەمیزاد دەبێ بڕوای بەخۆی بێ و لە باتی ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بێ، خەڵك ئەو بەسەربکەنەوە، با ئەم خەڵك بەسەربکاتەوەو لە باتی ئەوەی لێبگەڕێ، خەڵك خۆی بە خاوەنی مەسەلە بزانێ، با ئەم خۆی بە خاوەنی مەسەلە بزانێ![٦]

## خەلیفەی موسڵمانان خاکین

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لێ بێ)، لەو ڕۆژەی بووە خەلیفە، ئیدی ژیانی کەوتە زەحمەت و ناخۆشی، لەوەی لێیدەگێڕنەوە:

- عومەر خۆی خوتبەی دەخوێندەوە، جارێکیان لە خوتبە دواکەوت، خەڵك هەمووی هاتبوونە مزگەوت و ئەو دیار نەبوو، هەتا پاش کەمێك ئەوجا پەیدابوو، خەڵك لەسەر ئەوە گلەییان لێکرد، وەڵامی دانەوە: وەڵڵاهی هەر ئەو کراسەم هەیە، ئەوەش شورابوو،

٦ - متديات مكتبة الديوان، الشيخ الروحاني حسن الجمل لجلب الحبيب ، قصص حكماء قصيرة، ٢٠١٣/٤/٢٥.



نەوێرام بە تەڕی لە بەری بکەم، ئیدی هەتا بڕەك وشکبووەوە، ئینجا لەبەرم کرد و بەپەلە هاتم، ئەوەندە دواکەوتم.

ــ کاتێکیش لە سەرەمەرگی بوو، مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، کە برای (فاتیمە)ی ژنی عومەرە، هاتە لای عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ)، بینی کراسەکەی عومەر گەلێ پیس و چڵکنە، پێی ناخۆش بوو، بە فاتیمەی خوشکی گوت: ئێوە شمەکی بۆ ناشۆن؟!

فاتیمە گوتی: وەڵڵاهی هەر ئەو کراسەی هەیە، ئەگەر بیشۆین، هیچی نابێ لەبەری بکات، لەبەرئەوەیە کراسەکەی ئەوها بە چڵکنی دەبینی.(٧)

## موسڵمانان هەر بران

(هیرقەل)ی پاشای ڕۆم، کە زانی عەلی کوڕی ئەبی تالب و معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان لە نێوان خۆیاندا کەوتوونەتە شەڕکردن، نامەیەکی بۆ معاوییە نووسیی، لەو نامەیەدا هاتبوو:

لە هیرقەلی ڕۆمەوە بۆ معاویە

---

٧ - اسامة نعيم، ١٠٠٠ قصة تخشع بها القلوب، دار عالم الثقافة، اردن، ١٤٢٩هـ - ٢٠٠٩م، ص ١٤٨.







بەوەمان زانیوە، کە کەوتۆتە نێوان ئێوەو عەلی کوڕی ئەبی تالب.. ئێمەش وای دەبینین هەق بە لای ئێوەوەیە، بۆیە ئەگەر فرمانم پێ بکەن، سوپایەکت بۆ دەنێرم، بچن سەری عەلیت بۆ بێنن.

معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان، چونکە دڵی پڕ لە ئیمان و خواناسی بوو، بەم نامەیەی قەیصەر و پاشای ڕۆمە توڕە بوو و بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی دایەوە:

لە معاویەوە بۆ هیرقەل

ئێمە (من و عەلی)، دوو براینەو لە نێوان خۆمان تێکچووینە، تۆ چ هەقت هەیە دێیە بەینی ئێمەوە؟! ئەگەر وازنەینی و خۆت لاڵ نەکەی، سوپایەکت ڕەوان دەکەمە سەر، سەرەتاکەی لە لای تۆ بێ و کۆتاییەکەی لای من، ئەو سوپایە دەبێ سەری تۆم بێنن و بە دیاری بۆ عەلیی بنێرم.

## موسڵمانان زیرەك و وشیارن

موسڵمانان بە هۆی ئەو ڕێزەی لە غەیرە دینانی دەگرن، پەیوەندی باشیان لەگەڵ هەموو خەڵکی هەیە، دەگێڕنەوە: جارێکیان مەسیحییەك موسڵمانێك دەعوەت دەکات، بەخێرهاتنی دەکات و دوای کەمێ دانیشتن، دەچێ هەندێ ترێی بۆ دێنێ، موسڵمانەکە هەندێ لە ترێکە دەخوات!! پاش ئەوە مەسیحییەکە ترێکە دەباتەوەو









ئەوجارە عەرەق بۆ موسڵمانەکە دێنێ!! موسڵمانەکە عەرەقەکە ناخوات و ڕەتی دەکاتەوە، دەڵێ: عەرەق لە ئاینی ئێمە حەرامە، تۆ نابێ شتی وەها بۆ من بێنی؟!

مەسیحییەکە بە موسڵمانەکە دەڵێ: باشە ئێوە ترێ دەخۆن، کەچی عەرەقیش لە ترێ درووست دەکرێ و نایخۆن؟!

موسڵمانەکە دەڵێ: زۆر ڕاست دەکەی!! تۆ ژنت هەیە!!

مەسیحییەکە دەڵێ: بەڵێ.

موسڵمانەکە دەڵێ: دە بانگی بکە با بێتە ئێرە.

مەسیحییەکە بانگی ژنەکەی دەکات و ژنەکەی دێت لە بەردەمیان دەوەستێ.

ئەمجارەیان موسڵمانەکە ڕوو لە مەسیحییەکە دەکاتەوەو دەڵێ: زۆر چاکە!! ببوورە تۆ کچیشت هەیە!!

مەسیحییەکە دەڵێ: بەڵێ.

موسڵمانەکە دەڵێ: دە بانگی بکە، با ئەویش بێتە ئێرە.

مەسیحییەکە بانگی کچەکەشی دەکات و کچەکەشی دێت لە بەردەمیان دەوەستێ.











موسڵمانەکە دوای ئەوە ڕوو لە مەسیحییەکە دەکاتەوەو لێی دەپرسێ: ئەم کچەی تۆ لەو ژنەت نییە؟!

مەسیحییەکە وەڵامی دایەوە: بەڵێ لەو ژنەمە.

موسڵمانەکە گوتی: زۆر باشە، دەی با ئێستا ژنەکەت و کچەکەت بڕۆنەوە جێی خۆیان.

مەسیحییەکە ئاماژەی بۆ ژن و کچەکەی کرد، بڕۆنەوە جێی خۆیان.. ئەوانیش چوونەوە جێی خۆیان، پاش ئەوە مەسیحیەکە ڕووی لە موسڵمانەکە کرد، پێی گوت: مەبەستت لەم دەور و تەمسیلە چ بوو؟! بۆ هیچ ناڵێی؟!

موسڵمانەکە بە هێمنی و خەندەیەکی خۆشەوە وەڵامی دایەوە: با شتێ دەڵێم.

مەسیحییەکە گوتی: دە زووکە بیڵێ.

موسڵمانەکە گوتی: گوێبگرە برادەر.. گوتت: ئەو کچەم لەو ژنەمە.. وایە؟

مەسیحییەکە گوتی: ئێ وایە، دە بڵێ: مەبەستت چییە؟

موسڵمانەکە گوتی: بڕواشت بەوە هەیە، کە ژنەکەت بۆ تۆ حەڵاڵەو کچەکەت بۆ تۆ حەرامە؟!









مەسیحییەکە گوتی: بەڵێ.. بڕوام بەوە هەیە.. ئەدی چۆن؟!

موسڵمانەکە گوتی: دەی ترێ و عەرەقەکەش هەر وەهایە، خۆ مەرج نییە شتێ لە شتێکی تر بێ، ئەگەر یەکەم حەڵاڵ بێ، دووەمەکەش حەڵاڵ بێ.

مەسیحییەکە لێرەدا تێگەیشت، دەمارەکانی خاو بوونەوە، دڵی بۆ ئیسلام بووەوە، شایەدی ئەوەی دا، کە ئیسلام ئاینی ئەقڵ و حیکمەتە، ئەوەی گوتوویەتی هەمووی هەقیقەتەو پیرۆزە، بۆیە پڕ بە دڵ و دەست بەجێ شایەد و ئیمانی هێناو لە پێش برادەرە موسڵمانەکەی - کە تازە بووە برای ئیمانیی - گوتی: أشهد أن لا أله ألا الله وأشهد أن محمدا رسول الله...

## موسڵمانان زانستیان بۆ کارپێکردن دەوێ

ئەبولدەرداى صەحابی (ڕەزای خوای لێبێ)، ڕۆژێکیان لە نێو برا ئیمانییەکانی بوو، باسی ڕۆژی قیامەت و چارەنووسی خۆیان لەو ڕۆژە دەکرد، ئەبولدەردا خۆی بۆ نەگیراو لە ترسی ئەوەی مەبادا لەو ڕۆژەدا نەگاتە ڕەزامەندی خوداو لە ماڵوێرانان بێ، هۆن هۆن فرمێسکی بەسەر کوڵما هاتە خوار!!







صەحابەکانی تەکی تێگەیشتن بۆچی دەگری، بەڵام ویستیان دڵنیا بن، بۆیە لە هۆی ئەو گریانەیان لێ پرسی؟!

ئەبولدەردا وەڵامی دانەوە، گوتی:

- ئەوەی من زۆری لێ دەترسم ئەوەیە، دەڵێم مەبادا لە ڕۆژی قیامەتێ لێم بپرسن، بڵێن: ئەی عومەیر (واتە: عومەر، بچکۆڵەکە - کە ئەوە نازسناوی بووە -).. تۆ لە زانایان بوویت؟!

منیش وەڵام بدەمەوە بڵێم: بەڵێ.

ئەوانیش پێم بڵێن: باشە بەوەی دەتزانی، چیت کرد؟!

## موسڵمانان پێغەمبەری خوایان بەلاوە زۆر گەورەیە

(مەهدی) خەلیفەی عەباسی ڕۆژێکیان لە نێو وەزیر و ڕاوێژکارەکانی دانیشتبوو، پیاوێك هاتە ژوور و نەعلێکی لە قوماش درووستکراوی لە دەست بوو، نەعلەکەی بۆ خەلیفە (مەهدی) درێژ کرد و پێی گوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. ئەوەیان نەعلی پێغەمبەری خوایە (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، من بە دیاری بۆ تۆم هێناوە.

مەهدی بەڕێزەوە هەڵسایەوەو بە شەوقەوە گوتی: نا دەی بیهێنە.





کابرا نەعلەکەی دایە دەست مەهدی و مەهدی بە شەوقەوە ناو زگی نەعلەکەی ماچ کرد و فرمانی بە وەزیری دارییەکەی کرد: دە هەزار درهەم بدەنە ئەو پیاوە.

کابرا بەوە ئاواتەکەی هاتەدی!! زۆر دڵخۆشبوو، پارەکەی وەرگرت و ڕۆیشت.

پاش ئەوە مەهدی بە ڕەفیقەکانی گوت: پێتان وایە، من نازانم پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، نەك هەر ئەو نەعلەی لەبەر نەکردووە، نەشی دیوە؟!! نا من ئەوە دەزانم، بەڵام ئەگەر بێت و ئێمە بمانگوتبووایە: درۆ دەکەیت، ئەوە نەعلی پێغەمبەری خوا نییە (درودو سڵاوی خوای لەسەر)!!

ئەوا بە بێئومێدی و زمانێکی تیژەوە دەچووە دەر، لە بن گوێی خەڵکی دەیگوت: نەعلی پێغەمبەری خوام (درودو سڵاوی خوای لەسەر) بۆ خەلیفە مەهدی برد، بەڵام ئەو لێمی وەرنەگرت و پێمیدا ناردەوە!!

ئەوساش ئەوەی بڕوای پێ دەکرد، زۆرتر دەبوو لەوەی بڕوای پێ نەکات، چونکە ئەقڵییەتی زۆرینە ئەوەیە، بەگەڵ لاواز بکەون، لە دژی بەهێز، ئەگەر بێت و لاواز ستەمکاریش بێت!!





بۆیە زمانەکەیان کرِی و دیارییەکەیان قەبوڵ کرد و بڕوامان پێکرد و پێمان وایە، ئەوەی کردمان: باشتر و سەرکەوتووتر بوو!!

## موسڵمان لەگەڵ زاناو نەزانیش هەر دەژی

یەك لە زانا موسڵمانەکان ئامۆژگاری قوتابییەکی خۆی دەکات و پێی دەڵێت: ئەگەر لەگەڵ نەزانان دانیشتی، گوێیان بۆ بگرە.. ئەگەر لەگەڵ زانایانیش دانیشتی، گوێیان بۆ بگرە.. چونکە بە گوێگرتنت لە نەزانان سەبر و حیکمەتت دەردەکەوێت و بە گوێگرتنیشت لە زاناکان، زانستت زیاد دەکات!!

## موسڵمانان بە خودا پشت ئەستوورن

ئەڕوای کچی ئەوس چووە لای خەلیفەی ئومەوی (مەڕوانی کوڕی حەکەم) و شکایەتی لە سەعیدی کوڕی زەید کرد، گوتی: ئەو پیاوە بەشێکی ماڵەکەی منی داگیرکردووە!!

سەعیدیش ئاگای لە هیچ نەبوو و شتی وەهای لێوە نەدەوەشایەوە، چونکە ئیماندار بوو و لە خواترس بوو!! بۆیە مەسەلەکەی بۆ خودا جێهێشت و گوتی: ئەی خودایە.. ئەگەر ئەو







ژنـه درۆ دەکـات، چـاوەکانی کـوێر بکـەو لـەنێو ماڵەکـەی خۆیـدا بیکوژە.

ماوەیەك پاش ئەو دوعایە، ئەو ژنـه چـاوەکانی کـوێر دەبـن و ڕۆژێکیان دەکەوێته نێ بـیری ئـاوی نێـو ماڵەکـەی خـۆی و لەوێـدا دەمرێ!!

## خودا جێی متمانەی موسڵمانانه

عوقبەی کوڕی نافیع لەگـەڵ دە هـەزار جـەنگاوەری موسـڵمان بەرەو ئەفریقا چوو و له ساڵی (٥٠ی هیجری) ئەو کیشـوەرەی فـەتح کردو شاری (قەیرەوان)ی تیا درووستکرد.

دەگێڕنەوە: ئەو شـوێنەی شـاری قـەیرەوانی تیـا درووسـتکرد، دارستانێك بوو، پڕله مـار و دووپشـك و زینـدەوەرو گیانـداری تـری زیانبەخش بوو!!

عوقبه دەستی بەرزکردەوە دوعـای کرد، گوتی:

خودایه ئەو زینـدەوەر و گیانـداره زیانبەخشـانه لـەو ناوچـەیه وەدەرنێ، پاش ئـەوە هـات وەسـتاو وتـارێکی بـۆ ئـەو زینـدەوەر و گیاداره خەتەرناکانه دا، پێـی گـوتن: ((ئـەی خـەڵکی ئـەو دۆڵـە.. ئینشائەڵڵا ئێمه لێره دەمێنینەوە، جا ئێـوە دوورکەونـەوە)).. سـێ جار ئەوەی دووباره کردەوە.





دەڵێن: پاش ئەو دوعاو وتارەی چ بەردێك و دارێكمان نەدیت، ئیللا گیاندار و زیندەوەرێكی ترسناكی لە بن هاتە دەر و شوێنەكەیان جێهێشت!!

پاش ئەوە عوقبە بە سوپاكەی گوت: بە ((بسم الله))ەوە وەرنە خوار بۆ نێو دۆڵەكە..

سوپاكەش بە ((بسم الله))وە دەچنە نێو دۆڵەكە، دەڵێن: تا گەیشتینە دۆڵەكە ئەو زیانبەخشانە هیچیان لەوێ نەمابوون!!

بەمە خەڵكێكی زۆری بەربەرییەكانی ئەوێ شادەو ئیمانیان هێناو موسڵمان بوون!

## موسڵمانان بۆ خوا ئیش دەكەن

خالیدی كوڕی وەلید لە كاتی سەركردایەتیكردنی بۆ سوپای موسڵمانان، شەوێكیان لە نێو خیوەتگەی سوپاكەیدا دەگەڕا، لە یەكێ لە خیوەتەكاندا، گوێی لێ بوو، دوو جەنگاوەر قسە دەكەن، یەكەمیان بە دووەم دەڵێت: تۆ بۆ ناگەڕێیتەوە ماڵ، خۆ دەڵێن: دایكت بە دواتەوە شێت و هار بووەو بەردەوام لە دووری تۆدا دەگرییێت؟!





دووەم گـوتی: نـەوەڵڵا مـن ناڕۆمـەوە!! مـن دەمـەوێ وەکـو سەیفوڵڵا خالید و وەکو ئەبا عوبەیدەی جەڕاح و قارەمانـەکانی تـری سوپای موسڵمانان بە ئازایەتی ناو دەر بکەم.

خالید (ڕەزای خوای لـێبێ) ئـەم قسـەیەی زۆر بـەلاوە نـاخۆش بـوو؟! ئاخـەر چـۆن دەبـێ ئـەو هـەموو تێکۆشـان و لـە مـاڵ دوورکەوتنەوەو فرمێسکی دایك و باوك و ... هەموو ئەوانەو شتانی تریش، لە پێناوی ئەوە بێ: خاوەنەکەی ناو دەربکـات؟! بۆچـی ئایـا موسڵمان خواپەرستە؟! یـان خۆپەرسـتە؟! ئـێ بێگومـان موسـڵمان خواپەرستە!! ئەدی چۆن دەبێ لە هەڵەی عەقیدەیی وەها بکەوێت؟!

بۆیە خالید هاتە پێش خیوەتەکە، سەلامی کرد و ئـەوانیش دوو گەنج بوون، تازە هەڵهاتبوون، یەك پێ هەڵسانەوەو هاتنـە پێشـوازی خالیدی سەیفوڵڵا.

خالید کە بینی زۆر گەنجن، کەمێك هێور بـۆوە، چـونکە گـەنج هەڵە دەکات، ئەوە زۆر کێشـە نییـە، بـەڵام ئەگـەر پیرێـك وەهـای بگوتبووایە؟! ئەوە شتێکی زەحمەت بوو!!

خالید پرسی: کامەتان حەز دەکات ناوبانگی ئازایەتی بۆ خـۆی پەیدا بکات؟!

یەکێکیان گوتی: من بووم.









خالید پێی گوت: یانی تۆ بۆ ئەو مەبەستە هاتوویتە نێو سوپای موسڵمانان!!

گەنجەکە گوتی: بەڵێ.

خالید گوتی: کوڕەکەم تۆ هەڵەی!! وەڵڵاهی ئێمە لە پێناو بەرزکدنەوەی ناوی پیرۆزی ئەڵڵا نەبێ، نەهاتووینەتە دەر، بۆیە تۆبە بکەو بەیانی زوو بگەڕێوە لای دایکت، سوپاسی خواش بکە، تا ئێستا لە یەکێ لە جەنگەکان لەسەر ئەو نیازە نەمردی، دەنا بە بێ ئیمانی دەمردی!!

بەیانی بگەڕێوەو ئەو کاتەی نیازت بۆ خودا پاکبوویەوەو دایک و باوکت ڕێگەیان دای، ئەو کاتی وەرەوە نێو سوپای موسڵمانان.

## موسڵمانان خاوەنی عەهدو پەیمانن

لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا (ڕەزای خوای لێبێ)، سەرکردەی موسڵمانانی بەرەی ڕۆژهەڵات، قوتەیبەی کوڕی موسلیمی باهلی (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، شاری (سەمەرقەند)ی فەتحکرد، بەڵام بەبێ ئەوەی سێ داواکانی موسڵمانە فاتیحەکانیان پێ بڵێ: یان موسڵمان بن و دینی خوا قەبوڵ بکەن.. یان جزیە بدەن و لێبگەڕێن، بێین خزمەتتان بکەین و سەر و ماڵتان









لە هەموو دوژمنێك بپارێزین.. یانیش ڕێگەی شەڕ هەڵبژێرن.. بەڵام ئێمە ڕێگەی یەکەمان بەلاوە باشترە، چونکە ئیسلام ئاینی ڕەحمەت و بەرەکەتی خواییە بۆ هەمووان.. ئیدی تا سێ شەو و سێ ڕۆژ مۆڵەتتان هەیەو بۆ خۆتان سەرپشکن لەوەی کامەی هەڵدەبژێرن.

قوتەیبەی سەرکردە بۆ خەڵکی سەمەرقەند ئەو پرۆسەیەی ئەنجام نەدابوو، یەکسەر هەڵیکوتابووە سەریان و شارەکەی فەتحکردبوون.

بەڵام خەڵکی سەمەرقەند زانیبوویان ئەم کارەی قوتەیبە وەکو کار و دابی موسڵمانان نییە لە فەتحکردنی شار و ناوچەکان، بۆیە لیژنەیەکیان پێکهێنابوو، ئەو لیژنەیە نامەیەکی نووسیبوو و بە نێردراوێکیان ناردبوویانە لای خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لێبێ).

ئەو نێردراوە باسی ئەم ئەرکەی بەم شێوەیەی خوارەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت:

چەند مانگێك بەڕێوە بووم، لەو شاری دەچوومە ئەو شاری، تا گەیشتمە شاری (دیمەشق)ی پایتەختی خەلافەتی ئیسلامی، لەوێ لە دڵی خۆمدا دەمگوت: چۆن پرسیاری ماڵی سوڵتانی موسڵمانان بکەم - مەبەست خەلیفەی موسڵمانانە -، بەڵام دەترسام باسی سوڵتان بکەم، بمگرن و هەر بزریشم بکەن، بۆیە کاتێك گەورەترین قەسری دیمەشقم بینی، بینیم خەڵك دەچنە ناوی و دێنە دەر، منیش چوومە



ژوور، بینیم خەڵك لە ناویا دەچنە ڕکوع و سوجدە دەبەن و ئەڵقە ئەڵقە دانیشتوونە دەرس دەخوێنن، منیش سەیرم دەکردن، تا لە یەکێکیانم پرسی: ئەمەماڵی سوڵتانە؟!

وەڵامی دامەوە: نەخێر.. بەڵکو ئەوە مزگەوتی موسڵمانانە.. ئایا تۆ نوێژت نەکرد؟!

گوتم: نەخێر نوێژم نەکرد!

گوتی: بۆچی دینی تۆ چییە؟!

گوتم: دینی خەڵکی سەمەرقەندییە.

دوای ئەوە ئەو پیاوە لە بارەی ئیسلامەوە قسەی بۆ کردم، وردە وردە دڵم بۆ ئیسلام بۆوەو شادەو ئیمانم لە لای هێنا.. پاشان پێم گوت: من پیاوێکی غەریبەم، دەمەوێ سوڵتانی موسڵمانان ببینم، حەز دەکەم بۆ لای ئەوم ببەی.

گوتی: مەبەستت ئەمیری ئیماندارنە؟!

گوتم: بەڵێ.

گوتی: بەو ڕێگەیە دا بڕۆ، تا دەگەیتە ئەو خانووە.. (ئاماژەی بە خانوێك کرد، لە گڵ دروستکرابوو)، گوتی: ئەو ماڵی ئەمیری ئیماندارانە.











گوتم: گاڵتەم پێ دەکەی؟!

گوتی: نەخێر.. بەڵام وەکو گوتم: بەو ڕێیەدا بڕۆ و ئەو ماڵی ئەمیری ئیماندارانە، ئەگەر مەبەستت ئەوەیە ئەمیری ئیمانداران ببینی؟!

منیش ڕۆشتم، گەیشتمە ماڵەکە، بینیم پیاوێك قوڕی گرتۆتەوە، شوێنێکی ماڵەکەیان بەو قوڕە دەگرێت، خێزانەکەشی لەلایەتی و قوڕی بۆ دەکێشێ!! بۆیە گەڕامەوە لای ئەو پیاوەی ئەو ماڵەی پیشاندابووم، لێی توڕە بووم!!

گوتم: من پێمگوتی ماڵی ئەمیری ئیماندارانم پێ نیشان دە، تۆ ماڵی کرێکارێکی قوڕکاریت پیشان دام؟!

گوتی: نا برا نا؟!! ئەوەی تۆ بە کرێکاری قوڕکاری دەزانی، ئەوە خۆی ئەمیری ئیماندارانە!!

بەمە دڵنیا بوومەوە، بەڵام هێشتا دەتگوت: شکێکم هەر ماوە، ئاخەر پاشا چۆن دەبێ وەها بێ؟! ئەوەمان لە مێژووی چ فیرعەون و قەیسەرێك نەبیستووە؟! ناچار گەڕامەوە ئەو ماڵە، سەلامم کرد، ژنەکە چووەوە ژوور و پیاوەکە هاتە پێش، دەستەکانی شووشت، بە گەرمی پێشوازی لێکردم و پرسی: فەرموو چیت دەوێت؟!

گوتم: ئەمە نامەیەکە لە کاهینەکانی سەمەرقەندەوە.





ئەو نامەکەی لێ وەرگرتم و خوێندییەوە، دوای ئەوە وەریگێڕاو لە پشتی کاغەزەکەدا نووسی:

لە عەبدوڵڵا عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە بۆ والییەکەی بەسەر سەمەرقەندەوە: بۆ ئەو مەسەلەیەی لەو نامەیەدا باسی دەکەن، قازییەك دەستنیشان بکە.

دوای ئەوە ئەو کاغەزەی مۆرکرد و پێیدامەوە.

منیش وەرمگرتەوەو هاتمەوە، لە ڕێگا دەمگوت: ئەگەر لەبەر ئەوەی نەبێ، کە خەڵکی سەمەرقەند بڕوام پێناکەن و بە درۆم دەخەنەوە، من ئەو نامەیەم هەر لە ڕێگا فڕێ دەدا، ئاخەر ئەو چەند وشەیە چی بۆ خەڵکی سەمەرقەند دەکەن؟! چۆن ئەو چەند وشەیە دەتوانن ئەو سوپایە بەهێزو گەورەیە لە نێو سەمەرقەند وەدەرنێن؟! چۆن ئەو سێ چوار وشەیە دەتوانن ئەو سەرکردەیە لە سەمەرقەند بکەنە دەرەوە، لە کاتێکدا تەواوی ڕۆژهەڵاتی زەویی بە ئازایەتییەکەی خۆی خەریککردووە؟!

بەڵام بە یارمەتی خودا گەیشتمەوە سەمەرقەند، لە ڕێگە بگەیشتبومایە هەر شارێ، وەکو موسڵمانێك دەچوومە مزگەوتەکەی و نوێژم تیا دەکرد، خەڵکەکەشی دەهاتنە پێشوازیم و ڕێزیان لێ دەگرتم، کاتێك گەیشتمەوە سەمەرقەند، نامەکەم دا کاهینەکانی ئەو شارە، ئەوان خوێندییانەوە، چاویان تاریك بوو و







زەوییان لەبەر چاو تەسك بووەوە، گوتیان: ئاخەر ئەو سوپاو ئەو سەرکردەیە بەو چەند وشەیە چۆن لەو شارەی ئێمە دەردەچن؟! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چارەیەکی دیکەیان نەبوو، نامەکەیان بۆ والی عومەر بەسەر سەمەرقەندەوە برد.

کەچی کە والییەکەی عومەری خەلیفە بەسەر سەمەرقەندەوە نامەکەی خوێندەوە، یەکسەر جێبەجێی کرد، (جومەیعی کوڕی حازڕی باجی)ی وەکو قازی بۆ تەماشاکردنی ئەو مەسەلەیە دەستنیشان کرد.

قازی کاتێکی دیاریکرد بۆ دادگاییکردنەکە، لەو کاتەدا کاهینەکانی سەمەرقەند و سەرکردەی موسڵمانانی فاتیحی سەمەرقەندیش ئامادە بوون، قازی لە کاهینەکانی پرسی: سکاڵای ئێوە لەسەر چییە؟!

کاهینەکان گوتیان: قوتەیبە لە پڕ شاری ئێمەی داگیر کرد، بێ ئەوەی پێشتر وەکو دابی موسڵمانانی پێشە خۆی بکات و سێ هەڵبژاردنەکانمان لە پێش دابنێت.

قوتەیبە بەداخەوە ئەو کاتە کۆچی دوایی کردبوو، بۆیە قازی ڕووی لە جێنشینەکەی قوتەیبە کرد، لێی پرسی: تۆ دەڵێی چی؟



جێنشینی قوتەیبە گوتی: زەوییەکانی سەمەرقەند چڕ و پڕ و عاسێ بوون، قوتەیبە ترسا لەوەی ئەو سێ هەڵبژاردنەیان لەبەردەم دابنێ و ماوەیەکیان بداتێ بۆ بیرکردنەوە، خۆیان لێرەو لەوێ قایم بکەن، بەوەش فەتحی شارەکە بە زەحمەت بکەوێ و دووربکەوێتەوە، لەبەر ئەوە ئەو شێوازەی هەڵبژارد، بۆ گەیاندنی ئاینی خودا بە خەڵکی ئەو شارە.

قازی گوتی: وەکو موجاهید لە پێناوی خودا دەرچووینە، بۆ ئەوەی‌ئیسلام بگەیەنینە دەروونەکان، نەوەك بە زۆر و بە توندوتیژی وڵاتەکان داگیربکەین!!

دوای ئەوە قازی بڕیاری دا: موسڵمانان دەبێ لەو شارە بچنە دەر.. بەڵام پاش ئەوە بە پێی مەبادیئی ئیسلامی دەتوانن ئەگەر ویستیان بێنەوە بۆ فەتحی شارەکە.

ئیدی خۆر ئاوا نەبوو و سوپای ئیسلامی لە سەمەرقەند چوونە دەر.. خەڵکی سەمەرقەند وەکو ئەوەیان دیت، زۆر سەرسام بوون بە عەدالەت و گەورەیی ئیسلام و موسڵمانان!! ئاخەر قەت لەو بڕوایە نەبوون، کە ئەم چەند قسەیەی خەلیفە ئەو دادگرییەیان بۆ دەسەپێنێ و لە پێناوی ئەو خەڵکە بێدینە، دادگای ئیسلامی موسڵمانە فاتیحە ئازاکان لە شارەکەیان وەدەر دەنێ.. پێیان وابوو، ئەوەی لەو ئیسلام و موسڵمانانەیان دیت، قەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا شتی وەهایان











نەدیوە، گوتیان: موسڵمانان نەتەوەیەکن، فەرمانڕەوایەتییان ڕەحمەت و نیعمەتی خواییە، بۆیە ئەمجارە خۆیـان هاتنـەوە پێشـوازی سـوپای موسڵمانان و بەڕێزەوە بردنیانەوە نێو سـەمەرقەند، تـەنیا کەسـانێك نەبێ، ویستیان لەسەر دینی خۆیـان بمێننـەوە، ئـەوانیش ڕازی بـوون بەوەی جزیە بدەن!!

شایانی باسە: سەمەرقەند شارێکە دەکەوێت ئاسیای ناوەڕاست، لە وڵاتی ئەو دیو ڕووبار، لە بنەچـەدا ناوەکـەی (شـمـر ئـەبوکرەب) بـووە، کـە بـە مانـای (ڕووی زەوی) دێـت، لـە پاشـان ناوەکـەی ئاسانکراوەو بووەتە (شمەرکەنت) و دواتریش بووەتە (سەمەرقەند).

ئیبن و بەتوتە لە بارەیەوەی گوتوویەتی: لە گەورەترین و باشترین و جوانترینی شارەکانە، لەسەر کەنارەکانی دۆڵێك درووسـتکراوە، بـە دۆڵی قەصاڕین دەناسرێت، چونکە قەسر و کۆشکی گەورە گەورەی لێبووە، گوزارشتی لە هیممەتی خەڵکی ئەو شارە کردووە.

هەندێکی دیکە لە گەڕیدە عەرەبەکان وەهایـان وەصفکردووە، کە ئەم شارەی سەمەرقەند دوورێکی ڕاکشاوە لەسەر کەناری باشوری ڕووباری زرافشان.

ئەو شارەی سەمـەرقەندە بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی سەرکردەی موسڵمان (سـەعیدی کـوڕی عوسمـانی کـوڕی عـەفان) بـە شـێوەی ئاشتەوایی لە ساڵی (٥٥هـ ٦٧٥ز) فەتحکرا.. پاشان کەوتـەوە ژێـر







دەستی خەڵکی ناوچەکەو داگیریان کردەوە.. بۆ جاری دووەم سەرکردەی موسڵمان (سالمیکوڕی زیاد) لە ساڵی (٦١هـ- ٦٨١ز) دوای شەڕێکی توند فەتحی کردەوە.. دوای ئەوە لەبەر شەڕی خەڵکی ناوچەکە لە دژی موسڵمانان، دیسانەوە موسڵمانان لێی دەرچوونەوە، ئینجا بۆ جاری سێیەم قوتەیبەی کوڕی موسلیمی باهلی بەو شێودیەی گوتمان، لە ساڵی (٨٧هـ - ٧٠٥ز) فەتحی کرد، بەڵام ئەوەبوو ئەمجارە دادگای ئیسلامی سوپای ئیسلامی لەو شارە وەدەرنا، ئینجا بۆ جاری چوارەم لە ساڵی (٩٢هـ - ٧١٠ز) بۆ دوایین جار لەسەر ڕەزامەندی و قەناعەتی گەورەی خەڵکی ئەو شارە بە عەدالەتی ئیسلامی، هاتنەوە پێشوازی سوپای ئیسلامی و خۆیان و شارەکەیان بە ئیسلام بەخشی.

## ئیسلام ئاینی ئازادییەو زۆرکردنی تیا نییە

(زیگرید هۆنک)ی ژنە ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی دەڵێت: ((زۆر کردن لە دینی ئیسلامدا نییە)).. ئەمە مەبدەئێکە قورئانی پیرۆز چەسپاندوویەتی، بۆیە موسڵمانان ئیسلامیان بە زۆر بەسەر ئەو میللەتانەدا نەسەپاندووە، کە وڵاتەکانیان فەتحکراوەو کەوتوونەتە ژێر دەستی موسڵمانان، بەڵام بەبێ هیچ زۆرکردنێك.









پەیڕەوانی ئاینی مەسیحی، بە هۆی ناسینی ئیسلامەوە، وەکو چۆن خۆر لە بەفر بدات، دەیتوێنێتەوە، ئاواش مەسیحییەکان بوونە موسڵمان و لە نێو ئیسلامدا وەکو بەفر توانەوەو ون بوون!

دیسانەوە وەکو چۆن گوڵ مەیلی ڕووناکیی هەیە، بۆ ئەوەی زۆرتر بژی، بە هەمان شێوە مەسیحییەکانیش بەرەو ئیسلام چوون و بڕواو قەناعەت و ئیمانیان هاتە سەر ئەوەی بە هۆی ئیسلامەوە زۆرتر دەژین!!

بەم شێوەیە مەسیحییەکانی زوو یان بوونە موسڵمان، یانیش لەسەر دینی خۆیان مانەوە، بەڵام هەر بە ڕێز و سۆزەوە بۆ موسڵمانانیان ڕوانی و لەگەڵیان ژیان.(٨)

## هیچ فاتحێك لە موسڵمانان بەڕەحمتر نەبووە!!

(گۆستاف لۆبۆن)ی ڕۆژهەڵاتناس نووسیویەتی، دەڵێت: لە ڕاستیدا مێژوو فاتیحی بە ڕەحمی وەکو موسڵمانان و دینی لێبووردەی وەکو دینی موسڵمانانی نەدیوە!!

---

٨ - (شمس الله تسطع على الغرب، زيغريد هونكه ٣٦٤-٣٦٨ ط/ دار الأفاق الجديدة بيروت).



ئـەوەتا فاتیحـە موسـڵمانەکانی ئەسـپانیا، لـە سوارچـاکی و ئازایەتیدا بێ وێنە بوون، کەچی لەگەڵ غەیرە دینـەکان بەبـەزەیی و لەگـەڵ ژێرکەوتووانـدا ئەوپـەڕی لێبـووردە بـوون!! هـەر وەعـد و پەیمانێکیان بدابووایە، بە باشی بەجێیان دێنا!!»[٩].

## خۆزگە موسڵمانان لە ئەوروپا بمابوونایەوە

(هنری دی شامبون)ی بەڕێوەبەری گۆڤاری (ریفـی بـارلمنتیر)ی فەڕەنسی دەڵێت: ئەگەر بێت و سوپا وەحشییەکەی (شارل مارتـل)ی خوێنڕێژ بەسەر موسڵمانەکاندا سەرنەکوتبوونایە لـە فەڕەنسـا، ئـەوا وڵاتانی ئێمەی ئەوروپی نەدەکەوتنە تاریکایی سەدەکانی ناوەڕاست!! ئەو هەموو ئابڕووچوونەشیان تووش نەدەهات!! دەمـارگیری دیـنی و مەزهەبیش ئەو هەموو خوێنەی لە وڵاتەکانماندا نەدەڕشت!!

بە هـەمان شـێوە ئەگـەر لـە (بـواتییێ)ش سـەرکەوتن بەسـەر موسڵماناندا وەدی نەهاتبووایەو موسڵمانان لە ئەسپانیا دەرنەکرابان، ئەوا ئەسپانیا هەر بەو لێبووردەییە دەژیا، کـە موسـڵمانان و ئـاینی ئیسلام لەنێو خەڵکی مومارەسەیان دەکـرد و خـەڵکی ئەسـپانیایان لەسەر ڕاهێنابوو!! ئەوسا ئەسپانیا لە مەحاکیمی تەفتیشیش ڕزگاری

---

٩ – حضارة العرب، غوستاف لوبون، ص ٣٤٤











دەبوو، ئەو هەموو شەرمەزارییەی نەدەهاتەوە سەر!! شارستانیەتیش لەو وڵاتەدا هەشت سەدە دوا نەدەکەوت!!

ئیدی هەست و سۆزەکان لە بارەی سەرکەوتنی ئێمەی ئەورووپی بەسەر موسڵمانان هەرچەندە لێك جیاواز بێ، بەڵام ئەوەی گومانی لەسەر نییە، ئەوەیە، کە: ئێمە لە هەموو چاکییەکانی ژیار و شارستانیەتی خۆمان، لە بووارەکانی زانست و هونەر و پیشەسازیدا قەرزاری موسڵمانانین، هەق وایە دان بەوەدا بنێین، کە: موسڵمانان نمونەی مرۆی تەواو و کامل بوون، لە کاتێکدا کە ئێمە نمونەی هەمەجییەت و جەهل و نەزانی بووین!![10].

## ئیسلام لە توانایدا جیهان فێری ژیان بکات

ئەمیر تشالزی وەلی عەهدی بەریتانی لە بارەی ئیسلامەوە دەڵێت: ئیسلام لە توانایدایە ڕێگەی ژیان و تێگەیشتنمان لەگەڵ جیهاندا فێر بکات، کە ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، مەسیحییەت لەدەستی داوە!! چونکە ئیسلام ڕەتی دەکاتەوە، کە جیاوازی بخرێتە نێوان: ئادەمیزاد و سروشت!! دین و زانست!! عەقڵ و ماددە!! (الإسلام والغرب محاضره الأمير تشارلز فى مركز أكسفورد للدراسات الإسلاميه عام ١٩٩٣).

---

١٠ - لە کتێبی: صور من حياة التابعين، عبد الرحمن الباشا، دار الأدب الإسلامي، القاهرة، ط ١٥، ١٤١٨هـ -١٤٢٠ه





## موسڵمانان هۆکاری ئارامی و پێکەوە ژیانن

(کۆنت هنری دی کاستری) دەڵێت: مێژووی مەسیحییانم لە وڵاتە ئیسلامییەکان خوێندەوە، گەیشتمە هەقیقەتێکی زۆر ڕۆن و گەشاوە، ئەویش ئەوەیە: موسڵمانان (لەو سێزدە سەدانەی دەسەڵاتداری وڵاتانی خۆیان بوونە)، زۆر بە باشی مامەڵەیان لەگەڵ مەسیحییە ژێردەستەکانی نێو وڵاتانی خۆیان کردووە، ئەمە گوزارشتە لەوەی کەوا موسڵمانان زۆر بە باشی لەگەڵ غەیری خۆیان دەژین، بەڵام غەیرە موسڵمانان ئەگەر دەسەڵاتدار بووبوون، قەت لەگەڵ غەیری خۆیان وەکو موسڵمانانیان نەکردووە، ئەوەتا لە هەموو مێژوودا لە ئیسلامدا نابینین گروپانێکی ئاینی و پیاوانێکی ئاینی هەبن، بە دوای سوپای داگیرکەر بکەون و میللەتان ناچار بکەن، بۆ ئەوەی بێنە سەر دینی ئەوان!! بەڵام لە مەسیحیەت و ئاینەکانی تر، شتی وەها دەبینین!!

## موسڵمانان لە کاتی بەهێزیدا لێبووردەن

گۆتەی شاعیری بەناوبانگی ئەڵمانی لە بارەی لێبووردەیی موسڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیان دەنووسێت: بۆ هەق دەیڵێم، کە: لێبووردەیی موسڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیان لەبەر لاوازییان نییە، بەڵام موسڵمان لەگەڵ شانازیکردنی بە ئاینەکەی خۆی و بە توندی



گرتنی عەقیدەکەی خۆی، ئینجاش لەگەڵ غەیرە موسڵمانەکان لێبووردەیەو ستەم لە کەسیان ناکات!!

## ئیسلام ئازادی ئاینەکانی هێنا

(لین پۆل)ی ڕۆژهەڵاتناس دەڵێت: لەو کاتەوەی دەمارگیری ئاینی گەیشتبووە چڵە پۆپەو کەس غەیری خۆی قەبوڵ نەدەکرد، ئیسلام ئەو ڕۆژە هات و گوتی: دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم!!

ئەمەش چاوەڕواننەکراو و موفاجەئەیەکی خۆش بوو، بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی، کە نەیدەزانی ئازادی ئاینی چییەو تەنانەت دەشێ هەتاکو ئێستاش (غەیرە موسڵمانان) نەزانن ئازادی ئاینی چییە؟!

## ئیسلام ئاینی هەموو گەل و نەتەوەکانە

بەرنادشۆی فەیلەسوف دەڵێت: ئیسلام ئەو ئاینەیە، کە باشی تەواوی ئاینەکانی تری تیا بەدی دەکەین، بۆیە بەردەوام ئیسلام جێگەی ڕێزی زۆری من بووە!! چونکە تاکە ئاینێکە توانای ژیانکردن لە قۆناغە لەیەکجیاکانی هەیە، هەروەها بەدرێژایی هەموو سەردەمەکان توانای ڕاکێشانی دڵەکانی هەیە!! لەگەڵ یەکەم









سعاتەکانی دەرکەوتنیشیدا ئیسلام ئەوەی سەلماند، کە ئەو ئاینی هەموو ڕەگەزە مرۆییەکانە، ئەوەتا سەلمانی فارسی و بیلالی حەبەشی و صوهەیبی ڕۆمی و (گاوانی کوردی)ی لە خۆ گرت و هەمووانی لە نێو یەك بازنەدا پێکەوە بەستا.

## ئیسلام ئاینی ڕۆح و لاشەیە

(لامارتین)ی شاعیری بەناوبانگی فەڕەنسا دەڵێت: ئیسلام تاکە ئاینێکە، کە پێویستییەکانی ڕۆح و لاشە زامن دەکات و گرنگی بە هەردووکیان دەدات!! بێ ئەوەی وا بکات، موسڵمان هەست بە کەموکوڕییەك بکات!! (من روائع حضارتنا للدکتور مصطفی السباعي رحمه الله ص ٩١-٩٤).

## ئەوروپا بەرەو ئیسلامە

(لۆرد هەدلی) یەکێکە لە کەسایەتییەکانی بنەماڵەی پاشایەتی بریتانی، موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، بەمە سەرسامییەکی گەورە کەوتە نێو کۆمەڵگەی بریتانی، بەڵام ئەو بە بڕواو قەناعەتەوە موسڵمان ببوو، زیاد لەوە گوتی: ((لەو بڕوایە دام، کە هەزاران ژن و پیاو لەو وڵاتەدا هەنە، کە بە دڵ موسڵمانن، بەڵام لە ترسی لۆمەی











خەڵکی، کە پێیان دەڵێن: چۆن دینی خۆتان دەگۆڕن، ناوێرن خۆیان ئاشکرا بکەن و ئیسلام بە نهێنی لە دڵیاندا دێڵنەوە)).

لە بارەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیشەوە، ئاینی ئاشتی و خۆشەویستی دەنووسێت: ئیسلام ئەو ئاینەیە، کە دەتوانێ جیهانی مرۆیی لەسەر پەرستنی ﴿ئەللا﴾ی تاك و تەنیا کۆبکاتەوە، کە ﴿ئەللا﴾ لە سەرووی هەموانەوەیەو لە پێش هەموانیشەوەیە، زۆر بە ئاسانی هەموو بەندەیەك دەتوانێ پەیوەندی پێوە بکات، بێ ئەوەی چ میانەگیر و ڕێگرییەك بۆ ئەو مەسەلەیە هەبێ)).

(کۆنت هنری کاستری)ش لە کتێبەکەی خۆیدا (الإسلام خواطر وسوانح)دا ئاماژە بۆ توانای ئیسلام دەکات، لەسەر ڕاکێشانی دڵی زۆرینەی خەڵکی بۆ خۆی، ئەوە چونکە گرنگی زۆر بە مرۆڤەکان دەدات و لە قەدر و قیمەتیان بەرزدەکاتەوە، دەنووسێت: ((بەم شێوەیەی، کە گرنگی زۆر بە مرۆڤەکان دەدات و لە قەدر و قیمەتیان بەرزدەکاتەوە، ئیسلام توانی بەشێکی گەورەی جیهان بۆ خۆی ڕاکێشێ)).

توێژەری بەناوبانگ (سینکس)یش دەنووسێ: ((هەموو ڕۆژێ موسڵمانان زیاد دەکەن، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر زیندووەتی و گەورەیی ئاینی ئیسلام)).







گۆڤاری (تەلغراف)ی بریتانیش لە یەکێ لە ژمارەکانی نووسیویەتی: ((لە ماوەی ئەو سەدانەی دیکە، کە دێنە پێش، ئیسلام دەبتە هێزێکی کاریگەر بەسەر ڕووداوەکانەوە، ئەوەش بە هۆی بڵاوبوونەوەی زۆری لە نێوان میللەتانی دونیا، ئەوە جگە لەوەی موسڵمانان خۆشیان ساڵانە پەنجا ملیۆن کەسیان زیاد دەکات)).

بیرمەندی فەرەنسی (ئیتین دینیێ)ش دەڵێت: ((دەبێ ئەو هەقیقەتە بڵێین، کە ئیسلام لەگەڵ تەواوی ئارەزووەکانی شوێنکەوتووانی دەگونجێ، بە جیاوازی سروشتی هەر یەکەشیان، چونکە دینێکە بێسنوورە لە ڕوونی و ئاسانی، ئیدی خەڵکان بە ئاسانی بەرەو ڕێگەی ڕاست و سیڕاتی موستەقیم دەبات)).

## هەمووکەس عیشقی ئیسلامە!!

د. یوسف قەرزاوی گێڕایەوە: هەندێ لە قوتابیانی میسر لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم، بۆ تەواوکردنی خوێندن دەچنە فەرەنسا، لەوێ شوققەیەك دەگرن، بەیانیان زوو دەچنە زانکۆ و ئێوارە درەنگ دەگەڕێنەوە، ئەرکی خوێندنیان زۆر دەبێ و ناتوانن ئەرکی پاککردنەوەو ئیش و کارەکانی شوققەکەش بگرنە ئەستۆ، لەبەرئەوە بیردەکەنەوە کەسێك بگرن، بەیانیان دوای ئەوەی ئەوان دەچنە دەرەوە، ئەو کەسە بێت شوققەکەیان بۆ پاکبکاتەوەو هەندێ







وردە ئیشیان بـۆ بکـات.. لەسـەر ئـەو بڕیـارە ڕێکدەکـەون، دەچـن کچێکی فەرەنسی بۆ ئەم ئیشەیان دەدۆزنەوەو لە بەرامبـەر کرێیـەکی دیاریکراو، لەگەڵی ڕێك دەکەون.

ماوەییێك بەسەر کارەکـەی تێدەپـەڕێ، قوتابییـەکان زۆر لـە ئیشەکانی ئەو کچە ڕازی دەبـن، بـەڵام بەزەییشـیان پێـدا دێتـەوە، چونکە دەبینن: ئەم ئیشە بۆ ئـەو کچـە هێنـدە ئاسـان نییـەو ئـەو کرێیەشی، کە وەریدەگرێ هێندە زۆر نییە، ئەدی چۆن و لەبەرچی ئەم ئیشە دەکات؟

بۆیە یەك لەو قوتابییانە ڕۆژێکیان لەو کچە دەپرسێ: باشـە تـۆ کەست نییە؟!

کچەکە وەڵامی دەداتەوە: گوتت کەست نییە؟!

قوتابییەکە وەڵامی دایەوە: بەڵێ!

کچە گوتی: تۆ فلانە هۆتێلی پاریست دیوە؟! (ناوی هـوتێلێکی زۆر گەورەو نایابی پاریسی برد، کە لای هەمووان ئاشکرایە)!

قوتابییەکە گوتی: بەڵێ بینیومە!!

کچە گوتی: دە ئەم هوتێلە هی مامی منە.











قوتابییەکە بە سەرسامییەوە پرسی: ئەو هوتێلە هی مامی تۆیە؟! تۆش دێیتە لای ئێمەو بۆ پەیداکردنی لوقمە نانێك ئیش دەکەی؟!

کچە گوتی: ئەی چی بکەم؟!

قوتابییەکە پرسی: جا تۆ ئیشت بۆچییە؟! بۆچی ئەو مامەت یارمەتیت نادات؟!

کچە گوتی: نەخێر یارمەتیم نادات؟! لەبەرچی یارمەتیم بدات؟! لێرە کەس یارمەتی کەس نادات و هەرکەسەو بۆ خۆی دەژی؟!

قوتابیە میسرییەکە گوتی: دەنا دەزانی لای موسڵمانان خەڵك چۆن مامەڵە لەگەڵ کچی وەکو تۆ دەکەن؟!

کچەکە خۆی بێدەنگ کرد و چاوەڕوانی وەڵامی کرد؟!

قوتابیە موسڵمانەکە درێژەی پێدا: لای ئێمەی موسڵمان.. کچ هەتا لە ماڵی باوکی بێ، لە لایەن باوك و دایکییەوە گرنگی تایبەتی پێ دەدرێت و هەرچی پێویستییەکی هەیە، بۆی جێبەجێ دەکرێت!! کە باوك و دایکیشی نەماو چووە ماڵی خۆی، ئەو کاتی مێردەکەی باڵی بەسەردا دەکێشێ و هەرچی لە توانای بێ، بۆی وەدی دێنێ!! ئەگەر مێردیشی نەما، یان هەر مێردی نەکردبوو و دایك و باوکیشی نەما، برای، یان مام و خاڵی، یان خزمێکی نزیکی هەر دەبێ، باڵی







بەسەردا بکێشێ و بەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستییەوە ماڵ و ژیانێکی زۆر ئاسوودەی بۆ دابین دەکات، بەڵام لە هیچ کاتێکدا، ئەگەر بە ئارەزووی خۆی نەبێ، کەس ئیشی پێ ناکات؟! هەمووکەس لە کچەکەی خەرج دەکات و کچ ئەگەر ئیشیشی کرد، هەموو کرێکەی بۆ خۆیەتی و کەس هیچی لێوەرناگرێت!! مەگەر بە ڕەزامەندی خۆی لە ماڵ و منداڵی خۆی خەرج بکات.

کچە فەڕەنسییەکە وەکو ئەو قسانەی بیست، چاوەکانی پڕ ئاو بوون و وردە وردە فرمێسکی گەرم بەسەر ڕوومەتیدا هاتنە خوار!! پاش ئەوە ڕووی لە قوتابیە موسڵمانەکە کرد و پێی گوت: لای ئێوە وەها بۆ کچ و ژنان دەکرێ و هێشتاش وڵاتانی ئێمەی ڕۆژئاوا، ئیسلام و موسڵمانان بە ڕێزنەگرتن لە مافی ژنان تاوانبار دەکەن؟! وەڵڵاهی ئەوەی تۆ دەیڵێی، ئەوە مافی ڕاستەقینەی ژنانە، خۆ ئەگەر کچانی لای ئێمەش وەکو کچ و ژنانی لای ئێوەیان بۆ بکرابووایە، بە خودای ئەو سوپا گەورەیەی کچان و ژنان دەبینی، کە ڕژاونەتە شەقامەکان و بۆ پاروو نانێ، هەرچی کارێکی قورس و نەشیاو هەیە دەیکەن، ئەوا یەکیان لە ماڵ نەدەهاتنە دەر و بە ڕێزەوە لەگەڵ کەس و کاری خۆیان دەژیان و سوپاسی خوایان دەکرد؟!

کەوابێ: ئاینی ئێوەی موسڵمان ئاینی ژیانە، ئاینی ڕێز و خۆشەویستییە بۆ کچان و ژنان!!! بەڵام چ دەکەی، بە ناوی







پێشکەوتنەوە، لای ئێمە باری کچان و ژنان قورسکراوەو بۆ پارووە نانێك، چی کاری قورس و نەشیاوە پێیان دەکەن؟! دە خۆزگە ئێمەش ئیسلامان بناسیایەو سوودمان لێیوەربگرتبووایە!!

## لە دادگای موسڵماناندا خەلیفە و هاووڵاتی یەکسانن

ڕۆژێکیان ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبی تالب (ڕەزای خوای لێبێ)، قەڵغانەکەی لێ دەکەوێ (کە قەڵغان کراسە ئاسنێکە لە سینگ دەبەسترێ، بۆ ئەوەی لە شیر و تیرەکان خاوەنەکەی سەلامەت دەرچێ و بە ئاسانی زامدار نەبێ).

جولەکەیەك ئەو قەڵغانە هەڵدەگرێتەوەو دەڵێ: هی منە.

ئیمامی عەلی داوای دەکاتەوەو دەڵێ: تۆ چۆن قسەی وەها دەکەی؟! ئاخر تازە لە من کەوت و تۆ هەڵتگرتەوە!! بەڵام جولەکەکە هەر دانی نەناو هەر گوتی: نەخێر هی خۆمە.

لەبەر ئەوە ئیمامی عەلی پێی گوت: کەوابێ وەرە لەگەڵم بچینە لای قازی.

جولەکە بەگەڵ ئیمامی عەلی کەوت و چوونە لای قازی، قازی پرسی مەسەلە چییە: ئیمامی عەلی چۆنی گوتمان قسەکەی خۆی وەها گێڕایەوە.





قازی ڕووی لە جولەکەکەی کرد، گوتی: ئەتوو دان دەنێی بەوەی عەلی دەیڵێ؟! یان هەر لەسەر قسەی خۆت سووری، کە ئەو قەڵغانە هی تۆیە!!

جولەکە گوتی: نەخێر من لە قسەی خۆم پەشیمان نیم و هەر لەسەر قسەی خۆم سوورم، کە ئەو قەڵغانە هی خۆمە!!

بۆیە کەوابێ دەبێ مەسەلەکە بە شاهێد یەکلابکرێتەوەو شاهێدیش دەبێ دوو بن، لەبەر ئەوە قازی ڕووی لە ئیمامی عەلی کرد، لێی پرسی: ئەتو شاهێدت هەیە؟!

ئیمامی عەلی گوتی: بەڵێ.

قازی گوتی: بڕۆ بیهێنە.

ئیمامی عەلی چوو حوسەینی کوڕی هێناو حوسەین لە پێش قازی شاهێدی دا، کە ئەو قەڵغانە هی باوکیەتی.

قازی بە ئیمامی عەلی گوت: شاهێدێك نابێ و دەبێ شاهێدی دووەمیش بێنی.

ئیمامی عەلی گوتی: من بەس ئەو شاهێدەم هەیە!

قازی گوتی: کەوابێ قەڵغانەکە بۆ جولەکەکە دەبێ و دادگایی تەواو.





ئیمامی عەلی ڕازی بوو بەو دادگایە، چونکە ئەوە عەدالەتەو شەرعی خوایە، لۆیەگوتی: ئەمر بۆ خوایە.. و ویستی بڕوات.

بەڵام جولەکەکە وەکو ئەوەی دیت، گوتی: ئەو هەموو یەکسانییە؟! من و ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامی، پێکەوە لە پێش قازی بووەستین، بە بێ ئەوەی قازی جێگەیەکی جیاوازتر لە من بە خەلیفەی موسڵمانان بدات؟!

ئینجاش سەرەنجام قازی موسڵمانان بە شاهێدی خەلیفەی موسڵمانان ڕازی نەبێ، بڵێ: تۆ یەك شاهێدت هەیە، بەڵام شەریعەتی ئیسلامی دەڵێ: ئەوەی سکاڵا دەکات، دەبێ دوو شاهێدی هەبێ!! بۆیەش سەرەنجام هەقەکە بداتە منی جولەکەو داوای خەلیفەی موسڵمانان پشت گوێ بخات؟!

ئەرێ ئەم ئیسلامە چ ئاینێکی پیرۆز و ئەو موسڵمانانە نەتەوەیەکی چەندە گەورەن؟!

بەم شێوەیە، کابرای جولەکە هەستی کرد وردە وردە پاکبووەوە، تا بانگی کرد:جەنابی قازی

قازی سەری بڵند کرد، گوتی: فەرموو.

کابرای جولەکە گوتی: ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی موسڵمانان ڕاست دەکات، قەڵغانەکە هی ئەوە، لەبەر ئەوەش ئێوە





خاوەنی دینێکی ئەوەندە پیرۆز و موسڵمانی ئەوەندە نمونەیین، بۆیە ئەوە منیش دان بە ڕاستییەکە دەنێم و لە بەردەمی ئێوەش موسڵمانبوونی خۆم ڕادەگەینم، شایەدی دەدەم و دەڵێم: أشهد أن لا أله ألا الله وأشهد أن محمدا رسول الله...

بەمە خەلیفەی موسڵمانانیش عەلی کوڕی ئەبی تالب (ڕەزای خوای لێبێ) زۆر دڵخۆش و ئاسوودە بوو، سوپاسی خوای کرد و قەڵغانەکەشی وەکو دیاری پێشکەشی جولەکەکە کرد.

## موسڵمان مردن بە دۆست دەزانن!

کە بیلالی حەبەشی (ڕەزای خوای لێ بێ)، کەوتە حاڵی سەرە مەرگ، خێزانەکەی گریا، گوتی: وای لەو بەڵایە؟!

بیلال (ڕەزای خوای لێ بێ) پێی گوت: نا ژنی ئازیزم نا!!مەڵێ: وای لەو بەڵایە!! بەڵکو بڵێ: وای لەو خۆشییە!!

چونکە من بەیانی دەگەمەوە خۆشەویستەکانم، دەگەمەوە پێغەمبەر و هاوەڵە ئازیزەکانم!!







## موسلمانان بەرگری دەکەن و

## ستەم قەبوڵ ناکەن

دوای شەڕو پێکدادانێکی زۆریان لەگەڵ هێزەکانی سەرکردەی خەباتگێڕانی لیبی، عومەر موختار، ئیتالییەکان شکستیان هێناو نەیانتوانی کۆنترۆڵی باری ناوەخۆی لیبیا بکەن، بۆیە بیریان لەوە کردەوە دانوستان لەگەڵ خەباتکاران بکەن، بێگومان لە نێویشیان شێخی موجاهیدین عومەری موختار، چونکە ئەگەر توانییان قەناعەت بەو بکەن، وازبێنێ، ئەوە بێگومان تا ڕادەیەکی زۆر کارەکانیان دەچێتە پێش و سەریەشەیەکی زۆریان لە کۆڵ دەبێتەوە.

عومەر موختار و شورای خەباتکاران ئەو داوایەی ئیتالییەکانیان قەبوڵ کردو لە کات و شوێنی دیاریکراو پێکەوە کۆبوونەوە، ئیتالییەکان یەك لەو هۆکارانەی بەکاریان هێنا، بۆ وازهێنان و دانیشتنی عومەری موختار، پێدانی پارەو سامانێکی زۆر بوو، ئەوە بوو پێیان گوت: ئێمە ڕێزمان بۆ تۆ هەیە، ئێستاکە بەڕێزتان تەمەنتان چووەتە پێش و پێویستتان بە پشووە، بۆیە حەز دەکەین پشوو بدەی، وەرە بە ئارەزووی خۆت لە تەرابلوس، یان لە هەر کوێیەکی دی مەبەستتە، خانووێکی گەورەو شیاو بە مەقامی خۆتان بۆ درووست دەکەین، مانگانەش پێنج هەزار لیرەتان پێدەدەین، ئیدی وەکو کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی گەورە، بۆ خۆت



ڕۆڵ ببینەو هەرچی پێت باشە، بیکە، بەس دابنیشەو وازبێنە لە شەڕی ئیتالییەکان.

عومەر موختار گوتی: بە ڕاستی جوانە!! یانی خێراتی وڵاتی خۆم بە بەرتیل لە ئێوەی دوژمن و داگیرکەری وڵاتەکەم وەربگرم!! باشە ئێوە بۆ ئەو خانووە گەورەیە بۆ منی دوژمنتان درووست دەکەن و بۆ مانگانە ئەو هەموو پارەیەم پێدەدەن!! من مامۆستایەکی سەرەتاییم و ئەگەر ئێوە وازبێنن، مووچەی مامۆستایەتییەکەم بەشم دەکات و منیش وەکو هەر مامۆستایەکی دی بۆ خۆم بە سادەیی دەژیم، ئەگەر ئێوە ناچارتان نەکردبووینایە، ئێمە بۆ وەهامان دەکرد، بۆیە من پێتان دەڵێم مومکین نییە ئەو بەرتیلە لە ئێوە وەربگرم، ئامۆژگاریم بۆ ئێوە ئەوەیە، ئاقڵ بن و وڵاتەکەم جێبێڵن، ئەوسا ڕێزتان دەگرین و لە شەڕی ئێمە سەلامەت دەبن، دەنا ئەگەر بێت و لەسەر ئەو داگیرکارییەی خۆتان بەردەوام بن، ئەوا بەرتیل و فڕوفێڵەکانتان ساردمان ناکەنەوەو یان سەردەکەوین و یان شەهید دەبین.

### لە وتە گرنگەکانی عومەر موختار

١- من بڕوام بە هەقی خۆم لە ئازادی و هەقی وڵاتەکەم لە ژیاندا هەیە، ئەو بڕوایەش لە هەموو چەك و جبەخانەی دونیا بەهێزترە، کاتێك ئادەمیزاد شەڕ دەکات، بۆ ئەوەی داگیر بکات و







تالآن بکات، هەر کاتێك هەگبەکەی پڕ بوو، یان شەکەت بوو و هێزی بەسەر چوو، دەوەستێ و وازدێنێ، بەڵام کاتێك لە پێناو پیرۆزییەکانی خۆی و ولآتەکەی خۆی دەجەنگێ، ئەوا تا کۆتایی هەر بەردەوام دەبێ.

٢ـ ئەگەر بێت و مەدفەع شمشێرەکەم بشکێنێ، ناهەق هەقەکەم ناشکێنێ.

## چەند ئەزموونێکی موسڵمانان

### ١ـ ئەو چوارە دەستخەڕۆت نەکەن!!

یەك لە دانایان دەڵێت: چوار شت دەستخەڕۆت نەکەن: ڕێزلێنانت لەلایەن پاشاو دەسەڵاتداران.. پێکەنینی دوژمنت بە دەمت.. نزیکبوونەوەی ژنان لێت.. گەرمای زستانان.

### ٢ـ پیاو واتە نهێنی پارێز

پاراستنی نهێنییەکان بەڵگەیە لەسەر جەوهەری پیاوەکان، وەك چۆن خێر لە دەفرێك نییە پارێزگاری لەوەی نێو خۆی نەکات، بە هەمان شێوە خێر لە مرۆڤێکدا نییە نهێنییەکانی نەپارێزێت.









### ٣ـ کەسی مەرد و کەسی نامەرد

چاکەکردنت لەگەڵ پیاوی مەرد وای لێدەکات بە زووی چاکەکەت بداتەوە، بەڵام چاکەکردنت لەگەڵ کەسی نامەرد، وای لێدەکات جارێکی تر سوالت لێبکاتەوە!

### ٤ـ لەو سییانە ببوورە

یەك لە دانایان دەڵێت: سێ کەس ئەگەر تورە بوون لێیان ناگیرێت: نەخۆش و ڕۆژووەوان و موسافیر.

### ٥ـ ژن بۆ کێبڕکێ نییە!

پیاوێك هاتە لای دانایەك لێی پرسی: من ژنێکم خواستووە، کە گوازتوومەتەوە بۆم دەرکەوتووە، شەلەیە، جا ئایا لۆم هەیە بیگەڕێنمەوە؟! پێشتر من نەمپرسیوەو ئەوانیش نەیان گوتووە وایە، بەڵام ئەلهەقی ژنەکی باشەو چ عەیبێکی نییە!!

داناکە وەڵامیدایەوە: ئەگەر مەبەستتە کێبڕکێی پێ بکەیت، ئەوا بیگەڕێنەوە!









### ٦ـ کەسی پەشیمان

ئەوەی دەغڵەکەی ونکرد، لە ڕۆژی دروێنەدا پەشیمان دەبێتەوە!

### ٧ـ تاقیکردنەوە

یەك لە دانایان بە کوڕەکەی دەڵێت: ئەی کوڕی شیرینم.. ئەگەر دەتەوێت ببیە برادەری کەسێك تووڕەی بکە، ئەگەر لەسەر ئەو تووڕەبوونەی ستەمی لێنەکردی و هەقی خۆی پێدایت، ئەوا دەستبەرداری مەبە، ئەگەریش بە تووڕەبوونەکەی لێی تێکچوو و هەق و ناهەقی لێتەکەڵ بوو، ئەوا بە زوویی وازی لێبێنە.

### ٨ـ برادەر سێنە

یەك لە داناکان دەڵێت: برادەر سێنە، یەکیان وەکو خواردن وایەو لە هەموو کاتێك پێویستت پێی دەبێت.. یەکیش وەکو دەرمان وایە، هەندێ جار پێویستیت پێی دەبێت.. یەکیش وەکو دەرد وایە، چ کاتێك پێویستیت پێی نابێت!

### ٩ـ خەڵك ڕوواڵەت دەبینێ!!

لەوانەیە خەڵك ئەو برینە ببینن، کە بەر سەرت کەوتووە، بەڵام کەسیان هەست بەو ئازارەت ناکەن، کە بە هۆیەوەی بۆت درووستبووە!





## ١٠ـ دانایی

لە دانایەکیان پرسی: دانـایی چییە؟ گـوتی: ئەوەیـە جیـاوازی بکەی، لە نێوان ئەوەی دەیزانی و ئەوەی نایزانی!

## ١١ـ گرنگ بەردەوام بوونە

دڵۆپە ئاوێك بەردێك کون دەکـات، بـەڵام بـە دووبارەبوونـەوەو بەردەوامبوونی، نەك بە توندوتیژی!

## ١٢ـ ئامۆژگاری

ئەوەی بە نهێنـی قسـەی بـۆ براکـەی کـرد، ئـەوە ئامۆژگـاری کردووە، بەڵام ئەوەی بـە ئاشـکرا ئامۆژگـاری براکـەی کـرد، ئـەوە ئیهانەی کردووە!

## ١٣ـ تێگەیشتن هۆی ئاسوودەییە

زانیم ڕزقی من بۆ خۆمـەو کـەس نـاتوانێ بیبـات، بـەوە دڵـم ئاسوودە بوو! زانیشم کاری خۆم دەبێ خۆم بیکەم و کەسی تر بـۆمی ناکات، ئیتر خەریك بووم بە کاری خۆم!









### ١٤ـ زانا

زانا دەڵێ..هەرچەندەی زانستم زۆر تـر بێـت، ئەوەنـدە نـەزانی خۆمم بۆ بەدەر دەکەوێت!

### ١٥ـ زیادەڕەوی مەکە

ئەوەی زیاد لە پێویست خۆی خۆشبووێ، زیاد لە پێویست ڕقـی لە خەڵك دەبێ!

### ١٦ـ بێ هەست

ئەوەی بە ژان نەزانێ، گاڵـتە بە برین دەکات!

### ١٧ـ زمان ترسناکە

زمان ئێسك نییە، بەڵام ئێسك دەشکێنێ!

### ١٨ـ ئەوەی نێو دڵ گرنگە!!

ئەگەر وشە لە دڵەوە دەرچوو، لـەنێو دڵ جـێگیر دەبێـت، بـەڵام ئەگەر لە زمان دەرچوو، لە گوێچکەکان تێناپەڕێ!









## ١٩- ئاقڵ و بێ ئەقڵ

زمانی کەسی ئاقڵ لە دوای دڵیەتی، بەڵام دڵی مرۆڤی بێ ئەقڵ لە دوای زمانیەتی.

## ٢٠- عەیبی خۆت لەبەرچاو بێ

ئەوەی لە عەیبەکانی خۆی وردبووەوە بــواری ئــەوەی نـامێنێ قسە لە عەیبی خەڵکی بکات.

## ٢١- چیت بۆ خۆت دەوێ، ئەوە بۆ خەڵکی بکە!

وەها مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکــە، وەکــو حەزدەکــەی خــەڵکی مامەڵەت لەگەڵ بکەن.

## ٢٢- گوڵێك باشترە لە دەسکە گوڵ

تەنیا یەك گوڵ بدەیە مرۆڤێك لە ژیــانی خــۆی، باشــترە لــەوەی دوای مردنی دەسکە گوڵێك بخەیە سەر گۆڕەکەی!

## ٢٣- با خۆت گرانبەهاتر بی!

قەت هەوڵمەدە جل و بەرگەکانت گرانترین شت بن لــە تــۆ، تــا ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆت نەبینییەوە هەرزانتری لە جلەکانت!





## ٢٤- خۆت ڕیسوا مەکە!

کەس ناتوانێ ڕیسوات بکات، مەگەر بە یارمەتی خۆت نەبێت.

## ٢٥- زانا و نەزان

زانا نەزان دەناسێ، چونکە پێشتر نەزان بووە، بەڵام نـەزان زانـا ناناسێ، چونکە نە پێشتر و نە ئێستاش زانا نییە.

## ٢٦- با شتێ نەڵێین، لێی پەشیمان بین

حەسەنی کوڕی بەشار گوتوویەتی: سی ساڵ تێپەڕیوەو تیایانـدا شتێکم نەگوتووە، لە سەریان پەشیمان ببمەوە.

## ٢٧- ئەوەی غەیبەتی کردی، خێری خۆی پێ دای

پیاوێك هاتە لای فوزەیلی کـوڕی عییـاز و پێـی گـوت: فلانـە کەس کە دادەنیشێ، غەیبەتی من دەکات و بە خراپ باسم دەکـات، بێتامی کرد و واز نایینێ؟!

فوزەیل پێی گوت: ئەو بەو کارەی، خێرێکی زۆری خۆی بـۆ تـۆ ڕەوانە کرد!! واتە: سەخڵەت مەبە.. بەوەی کەوا لە وەسفی تۆ دەیلێ و دەیەوێ تۆ ناشرین بکات، ئەوە خێری خۆی بۆ تۆ دەنێـرێ و خـۆی دەستبەتاڵ و ڕەنج بە خەسار دێڵێتەوە، ئیدی بۆچی نیگەرانی؟!







## ٢٨ـ چوونە ناو دڵی براکەت

خەلیفەی دووەم و ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: سێ شتن دەبنە هۆی ئەوەی لە سینگی براکەتدا تۆ خۆشەویست ببی، ئەوانیش ئەوانەن:

یەك: کە پێیگەیشتی زوو سەلامی لێ بکە.

دوو: کە هاتە مەجلیسەکەتان جێی بۆ بکەوە.

سێ: کە بانگیت کرد، بزانە چ ناوێکی لە هەمووان پێ خۆشترە، بەو ناوەوە بانگی بکە.

## لای موسڵمان بە زۆر و کەمی نییە، بە بەرەکەتی خوایە

کە ئەبو جەعفەری مەنصور بووە خەلیفەی موسڵمانان، یەك لە زانایە لە خواترسەکان هاتە لای و ئامۆژگاری کرد، پێی گوت:

ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لێ بێ)، کە گەشتە سەرە مەرگی خۆی، یانزە کوڕی هەبوو، هەموو ئەو سەروەتەی هەیبوو، بەسەری دابەشکردن، هەریەکەو پانزە درهەمی بەر کەوت، بۆیە کە گەیشتە دوا ساتەکانی گیان دەرچوونی پێی گوتن: کوڕەکانم ئیدی هیچێکم نییە، تا وەسیەتی لەسەر بکەم!!



هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکیش کە مرد، یانزە کـوڕی هـەبوو، بۆ هەریەکەیان یەك ملیۆن دیناری جێهێشت!!

سـەیر ئەوەیـە، لـە پاشـاندا منداڵـەکانی عومـەری کـوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لـێ بـێ) هـەموویان دەوڵەمەنـد بـوون، تەنانەت یەك لە کوڕەکانی بە تەنیا سوپایەکی موسڵمانانی بۆ شەڕی دژی کافران ئامادە کرد، ئەو سوپایە پێکهاتبوو لە سەد هەزار سوار، بەڵام منداڵەکانی هیشام، هەموویان هەژار کەوتن و کەسیان نـەبوو، ئەوەندەی هەبێ، خێری پێ نەچێ!!

## موسڵمانان بە دوو شت بێغەم دەبن

لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی گوت: ئەگـەر دوو شـتت پاراسـتن، ئیدی غەمی ئەوەت نابێ، هەرچییەکی دیکەت ون کردن.

کوڕەکەی پرسی: ئەو دوو شتە چین؟!

لوقمان گوتی: ئەو دوو شتە بریتینە لە درهەمەکەت بۆ ژیـانی دونیات، دینەکەشت بۆ ژیانی دوامابیت.








## موسڵمانان دوعای چاك بۆ هەمووان دەكەن

عەبدوڵڵای كوڕی خییار دوعای دەكرد، دەیگوت: خودایە ئێمە سەلامەت بكەو ئیماندارانیش لە زیانەكانی ئێمە سەلامەت بكە.

ئەمەش دوعای هەموو موسڵمانانەو باب و باپیرانی ئێمەی كوردیش، خوشك و برا موسڵمانە باشەكانی ئێستاش، هەمیشە هەر ئەو دوعایە دەكەن!! چونكە دەزانن، كە ئاینەكەیان ئاینی ئاشتی و خۆشەویستی، ئاینی ئارامی و ئاسوودەییە.

## ئیسلام ئاینی ژیانەو خۆشەویستی!!

شار مەدینەی پێغەمبەری خواو مزگەوت مزگەوتی پێغەمبەری خوایە (درودو سلاوی خوای لەسەر)، ئەمیری ئیمانداران عومەری كوڕی خەتاب نوێژی عەسری بۆ موسڵمانان كرد، دوای زیكر و دوعاكانی بۆ هیدایەتی خوایی بۆ كۆمەڵگای مرۆیی و سەركەوتنی سوپای فاتیح و موجاهیدی موسڵمانان لە بەرەكانی فارس و ڕۆم و هاتنەدی هیوای هەموو گەورەو بچووكێكی موسڵمانان، ئەمیری ئیمانداران و چەند سەحابەیەكی بەڕێز لەو شوێنە پیرۆزە دانیشتن و لەسەر پەرستش و قورئان خوێندن و دوعاو پاڕانەوەكانیان مانەوە.



لەو کاتەدا دوو گەنج پیاوێکی دەست بەستراویان هێنایە ئەو مەجلیسە پڕ شکۆیە، سڵاویان کردو ڕوویان کردە ئەمیری ئیمانداران، پێیان گوت:

ـ ئەی ئەمیری ئیمانداران.. ئەو پیاوەی لەگەڵ خۆمان هێناومانە بەر دەستی بەڕێزتان، ئەوە بکوژی باوکمانە، داوات لێ دەکەین تۆڵەی باوکمانی لێ بکەیتەوەو بە قەصاصی عادیلانەی خۆی بگەینی.

ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) کە ئەوەی بیست، زۆر ناڕەحەت بوو؟! ئا لەو کاتە پیرۆزەو لەو شوێنە پیرۆزە، چۆن کێشەیێکی هاتە بەر دەست؟! تەماشای پیاوە دەست بەستراوەکەی کرد، بینی پیاوێکی داماو و هەژارەو بە ڕاستی بە پیاوکوژ ناچێ؟! ئەدی چۆن ئەو کارەی کردووە؟! ئایا دەبێ سکاڵای ئەو دوو گەنجانەی هێناویانە، ڕاست بێ؟!

بۆ نەهێشتنی گومان، ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕووی پرسیاری کردە کابرای دەست بەستراو و لێی پرسی: ڕاستە تۆ بکوژی باوکی ئەو گەنجانەی؟!

کابرا وەڵامی دایەوە: بەڵێ.. ئەی ئەمیری ئیمانداران!!











ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) زیاتر ناڕەحەت بوو؟! ئەوە کەوابێ ئەو سکاڵایەی ئەو گەنجانە هەیانە ڕاستەو ئەو پیاوە دەست بەستراوە پیاوکوژە؟! بەڵام باشە لەبەر چی؟! ڕووی کردەوە پیاوکوژەکە، لێی پرسییەوە: باشە لەبەر چی باوکی ئەو گەنجانەت کوشت؟!

کابرای پیاوکوژ وەڵامی دایەوە: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. بڕوا بکە من پیاوکوژ نیمە، موسڵمانێکی ئاساییمەو ژیانی ئاسایی خۆم دەبەمە سەر، کاری من باخچەوانییە، لە فلانە باخچەی فلانە شوێنی نزیك ئەو شارە کار دەکەم، باوکی ئەو گەنجانە چەند وشترێکی پێ بوون، بە نێو باخچەکەی منی دابردن، ئەو وشترانە زیانی زۆریان بە باخچەکەی من گەیاند، منیش زۆرم ئاگادار کردەوە، کە ئەو وشترانە بە زوویی دەربکات و با زیاتر باخچەکەم تێك نەدەن، کەچی باوکی ئەمانە گوێی پێ نەدام و وشترەکانی هەر دەرنەکرد، منیش توڕە بووم و بەردێکم تێ گرت، بەرد چوو بە شوێنێکی ناڕەحەتی باوکییان کەوت و بەربوویەوە، وەکو چوومە سەری، بینیم مردووەو گیانی تیا نەماوە!! ئیدی مەسەلەی ئەو پیاوکوژییەم بەو شێوەیە بۆ درووستبوو!!









ئەمیری ئیمانداران پێی گوت: جا کەمێکی تر ئارامت بگرتبووایە باشتر نەبوو؟! باشە نەتدەزانی سزای کوشتن کوشتنەوەیە؟! ئیێ بۆ وەها پەلەت کرد؟!

کابرای پیاوکوژ گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. من ئەوەم دەزانی، بەڵام ئیشەکە هات و زۆر سوپاس بۆ خوا، من بە قەزای خوا ڕازیم!!

ئەمیری ئیمانداران لێی پرسی: ژن و منداڵت هەیە؟!

کابرای پیاوکوژ گوتی: بەڵێ، ژن و منداڵم هەیەو ئەوانیش هێندە غەریبن، لە ئاسماندا خوداو لەسەر زەوی منیان هەیە، بەڵام بۆ ئەوانیش خوا گەورەیەو خودا پەکی کەس لەبەر کەس ناخات!!

ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ)، وەکو ئەو قسانەی بیست؟! بەزەیی زۆری بەو پیاوکوژە هاتەوە؟! ئاخەر کەوابێ وەکو لە سەرەتاوەش بۆی چوو، ئەو داماوە پیاوکوژ نییە!! بەڵام تازە بەڵایەکە بە سەری هاتووەو چاری نییە دەبێ، بەرگەی بگرێ!! بەڵام خۆ ژن و منداڵەکانیشی غەریب و بێکەسن؟!

ئەمیری ئیمانداران لە دڵی خۆیدا گوتی: خوای گەورە لە هەمووان بە بەزەییترە، با چاوەڕێ بکەین، بزانین خوای گەورە چی دەکات؟!

ئەمیری ئیمانداران کەمێك بێدەنگ بوو لەو بیرانەی دابوو، کە:



- ئایا ئێستا چی بکەین؟! یەکسەر قەصاص لەو پیاوکوژە هەژارە وەربگرینەوە؟! یان دەکرێ بە شێوەییێکی تر ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێ و ئەو پیاوە هەژارە، کە پیاوکوشتنەکەی عەمدەن نەبووە، رزگاری ببێ؟! بۆ ژن و منداڵەکانی خۆی بمێنێتەوە؟!

بۆ ئەو مەسەلەیە بیرێکی بۆ هات، لە دڵی خۆیدا کەمێك دڵخۆشبوو و گوتی: ئەگەر ئەمە سەربگرێ، ئەوا کێشەکە بەبێ قەصاصیش چارەسەر دەکرێ؟! ئیدی یەکسەر ئەمیری ئیمانداران ڕووی لە دوو گەنجە باوککوژراوەکان کرد، پێی گوتن: ئێوە ئامادەن لەو پیاوە هەژارە خۆش بن؟!

گەنجەکان گوتیان: نەخێر ئەی ئەمیری ئیمانداران!! خۆ تەرمی باوکمان هێشتا لەوێ کەوتووەو خوێنی بێنازی لێ دەتکێ؟! ئیدی چۆن لە بکوژەکەی خۆش بین؟!

ئەمیری ئیمانداران ئەو ڕێگەیەشی لێ گیرا.. ڕووی لە پیاوکوژەکە کرد، پێی گوت: کەوابێ دەبێ ئێستاکە قەصاصی عادیلانەی خواییت بەسەردا جێبەجێ بکەین!!

پیاوکوژە هەژارەکە گوتی: ئاساییە ئەی ئەمیری ئیمانداران.. بەڵام وەکو گوتم: ژن و منداڵەکانم غەریبن و لە من زیاتر کەسی دیکەیان نییە، بۆیە ڕوخسەتم بدە، دەچمەوە لایان خواحافیزییان لێ دەکەم، دەڵێم: شتێکی وەهام بەسەردا هات، ئیتر چاوەڕوانی من مەبن و









پشت بە خودای گەورە ببەستن، پاش ئەوە دێمەوە بەر دەستی بەڕێزتان و شوکر و سوپاسی خوا دەکەم، لەسەر ئەو سزایەی بۆم دانراوەو هیچ لارییەکیشم لێی نییە.

ئەمیری ئیمانداران ئەوەی بیست، زیاتریش ئەو پیاوەی خۆشویست؟! ئاخەر ئەو پیاوە بەڕاستی ئیماندارێکی خوداناسە، بەڵام چ دەکەی؟! دەبێ لەبەر چ حیکمەتێك ئەو ئیشە ڕووی دابێ؟!

ئەمیری ئیمانداران پێی گوت: باشە ڕوخسەتت دەدەین، بەڵام بۆ چوون و هاتنەوە چەند ڕۆژت دەوێت؟!

کابرا گوتی: سێ شەو و سێ ڕۆژم دەوێت.

ئەمیری ئیمانداران پێی گوت: باشە کەفیلێکمان بۆ بێنەو برۆ.

کابرا گوتی: وەڵڵاهی هیچ کەفیلێك شك نابەم!

ئەمیری ئیمانداران بە سەرسوڕمانەوە پرسی: یانی لەو شارەدا کەسێك نییە بتناسێ و ببێتە کەفیلت؟!

کابرا گوتی: نەوەڵڵا ئەی ئەمیری ئیمانداران!!

ئەمیری ئیمانداران زۆری سەیر پێ هات؟! ڕووی لەو سەحابە بەڕێزانە کرد، کە لە مەجلیسەکەی دانیشتبوون، لێی پرسین: ئێوە کەستان ئەو پیاوکوژە دەناسن؟!



هەموویان گوتیان: نەخێر ئەی ئەمیری ئیمانداران!!

ئەمیری ئیمانداران نەیزانی چی بکات؟! ئێ باشە ئەی چۆن ئەو پیاوکوژە ئیزن بدات؟! ئەوە مەسەلەی کوشتنەوەیەو ڕوح شیرینە!! کێ دەڵێ: پاش سێ شەو و سێ ڕۆژی تر وەکو ئێستا قسەی خۆش دەبێ و دێتەوە؟!

ئەمیری ئیمانداران سەرێکی هێناو سەرێکی برد، بیرۆکەییەکی دیکەی بۆ هات، ڕووی لە سەحابە بەڕێزەکان کرد، پێی گوتن: کەستان هەیە کەفالەتی ئەو پیاوکوژە بکات، تا دەچێت و دێتەوە؟!

ئەبوزەڕی غەفاری (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران.. من کەفالەتی دەکەم و با بڕوات!!

ئەمیری ئیمانداران بەوە دڵخۆشبوو، پیاوکوژە هەژارەکەی ئیزن داو کابرا بەم شێوەیە گەڕایەوە لای ژن و منداڵەکانی.

سێ شەو و سێ ڕۆژ بەسەر ئەو دیمەنەی پێشوودا تێپەڕی، ئەمیری ئیمانداران پێشنوێژی عەسری بۆ موسڵمانان کرد، ئەزکارەکانیان خوێند و دوعای خێریان بۆ خۆیان و موسڵمانان کرد، پاش ئەوە چوون دانیشتن، سەحابەکانی ئەو ڕۆژە ئامادەبوون هەموویان هاتبوون، دوو گەنجە باوککوژراوەکانیش هاتبوون، ئێستاکە وادەی گەڕانەوەی









پیاوکوژەکەیـە، هــەموو چـاوەڕوانی گەڕانــەوەی بــوون؟! بــەڵام پیاوکوژەکە دیار نەبوو؟!

سەحابەکان وردە وردە مەترسییەکانیان زیاتر دەبـوو و ناڕەحـەتییان زیاتر دەبوو، هەموو دوعایان دەکرد، خـودا ئـەو مەسـەلەیە ئاسـان بکات و ئەبوزەڕی غـەفاری تووشـی بەڵایـەك نـەبێت، ئاخـەر ئـەوە ئـەمیری ئیمانـداران عومــەری کـوڕی خەتابـە، لـە بـاری ئاسـاییدا ئەبازەڕی هێندە خۆش دەوێ، ئەبا زەڕ داوای چاوەکانیشی لێ بکات، دەسـتی بـەڕووەوە نـانێ و نـاڵێ پێتیـان نـادەم!! بـەڵام مەسـەلەکە مەسەلەی جێبەجێکردنی حوکمێکی شـەرعییە، ئێسـتا ئەگـەر ئـەو پیاوە نێتەوە، ئەمیری ئیمانداران ئەبازەڕی کەفیلی لـە شـوێنی ئـەو دەکوژێتەوەو هیچ سلەمینەوەیەکیش لەو مەسـەلەیە ناکـات؟! ئـەی باشە دەبـێ چـی بکـەین؟! خـوای گـەورە ڕەحـم کـات، بـە ڕاسـتی مەسەلەکە نادیارە؟! بەڵام خودا لە هەمووان بەڕەحمترە!!

هەموو غەریقی بیرکردنەوە بوون و کابراش هەر دیار نییـە؟! ئـەی خودایە ئەدی چی بکەن؟!

لەو بیرانەدا بوون، خودا دەرووی خێری کردەوەو بینییان پیاوکوژەکە بە دیار کەوت، وردە وردە هەنگاوی بۆ لایان دەناو هات سـەلامێکی کرد و چوو لە پێش دەستی ئەمیری ئیمانداران وەسـتا، گـوتی: ئـەی



ئەمیری ئیمانداران ئەوەتا گەڕامەوە لات، بفەرموون سزاکەم چییە، جێبەجێی بکەن!!

ئەمیری ئیمانداران پرسی: خوا حافیزیت لە ژن و منداڵەکانت کرد؟!

کابرا گوتی: بەڵێ.

ئەمیری ئیمانداران پرسی: چۆنت جێهێشتن؟!

کابرا وەڵامی دایەوە: وەڵڵاهی وەکو ئەو بێچووە باڵندانەم جێهێشتن، کە دایکیان دەبینن، ئەوان هەموو دەمیان کردۆتەوە بۆ ئەوەی دایکیان شتێکیان بۆ تێبخات، لە برسیەتییەکەیان ڕزگار بکات؟! بەڵام پێم گوتن: چیدیکە چاوەڕوانی من مەکەن و پشت بە خودای گەورە ببەستن!! ئیدی بە چاوی بە فرمێسک و غەمی زۆرەوە لێك جودابووینەوە!!

ئەمیری ئیمانداران گەلێکی بەزەیی پێدا هاتەوە، پێی گوت: باشە کاکە ئەدی تۆ نەتدەزانی ئەوە مردنەو دەتکوژینەوە؟! ئەدی بۆ هاتیتەوە؟!

کابرای پیاوکوژی هەژار گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. من ئەوەم دەزانی، لە ترسی ئێوەش نەهاتمەوە، بەڵام زانیم ئەوە قەدەری منەو



لە ترسی ئەو خوایە هاتمەوە، کە لە هەر شوێنێك بێ دەمبینێتەوە، بۆیە سوپاسی خوام کردو هاتمەوە؟!

ئەمیری ئیمانداران وەکو ئەو قسانەی لەو پیاوکوژە هەژارە دەبیست، هەمیشە بەزەیی و سۆزی بۆی زیاتر دەبوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: بە خودای ئیماندارێکی وەها باش، نارەحەتە بکوژرێتەوە؟! بەڵام ئەدی چی بکەین؟! کەمێ بیری کردەوە، ویستی سوود لە کات وەربگرێ، بەڵکو خوای گەورە دەروێکی خێر بکاتەوە؟! بۆیە ڕووی پرسیاری لە ئەبا زەڕ کرد.. لێی پرسی:

- ئەبا زەڕ تۆ ئەو پیاوەت دەناسی؟!

ئەبازەڕ: نەخێر ئەی ئەمیری ئیمانداران!

ئەمیری ئیمانداران: دەتزانی ناوی چییە؟

ئەبازەڕ: نەخێر ئەی ئەمیری ئیمانداران!

ئەمیری ئیمانداران: دەتزانی لە کامە هۆزەیە؟

ئەبازەڕ: نەخێر ئەی ئەمیری ئیمانداران!

ئەمیری ئیمانداران: دەتزانی لە چ بیابانێکییە؟

ئەبازەڕ: نەخێر ئەی ئەمیری ئیمانداران!







ئەمیری ئیمانداران پرسی: باشـە چ گومانـت هـەبوو لـەوەی، کـە ئەگەر ئەو پیـاوە نێتـەوە، مـن تـۆ لـە شـوێنی ئـەو دەکوژمـەوەو قەصاصی عادیلانەت بەسەردا جێبەجێ دەکەم؟!

ئەبازەڕ گوتی: نەخێر ئەی ئـەمیری ئیمانـداران! دەمزانـی تـۆ لـە پێناوی خوا لە کەس ناترسـی و هـەموو بڕیـارێکی خـوا، جێبـەجێ دەکەی!!

ئەمیری ئیمانداران پرسی: ئەدی لەبەرچی کەفالـەتی ئـەو پیـاوەت کردو سێ شەو و سێ ڕۆژە هەموانت خستە دڵە ترسێ؟

ئەبازەڕ گوتی: لەبەر خاتری خوا، چونکە زۆرم پێناخۆش بوو، بڵێن: لە کۆمەڵگای پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خـوای لەسـەر) بـڕواو متمانە نەماوەو کەس ناتوانێ کەفالەتی کەس بکات، بۆیە گوتم: من کەفالەتی ئەو پیاوە دەکەم، ئەوپەڕەکەی دەکوژرێم و دەبمە قوربـانی ڕێگەی خودا، بەڵام ئەوەم زۆر بـەلاوە خۆشـترە، قسـەی نـاخۆش لـە بارەی کۆمەڵگای پێغەمبەری خواوە ببیسم و بڵێن، وایان لێهـاتووە، کەس کەفالەتی کەس ناکـات، ئەوەنـدە بـێ متمانـەیی لـە نێویـان بڵاوبۆتەوە!!

ئەمیری ئیمانداران بەو هەڵوێستە گەورانە زۆر دڵخۆش بـوو، ڕووی لە پیاوکوژەکە کردەوە، پێی گـوت: باشـە کاکـە خـۆ کـەس مـاڵ و







شوێنی تۆ و کەس هیچی لە بارەی تۆوە نەدەزانی، ئـێ خـوداش بـە ڕەحمەو دەشیا وەها زوو تۆڵەت لێ نەکاتەوە، ئەدی بۆچی هاتیەوە؟!

کابرا گوتی: وەڵلاهی لەبەر ئەوە هاتمەوە، گـوتم: مـەبادا بڵـێن لـە کۆمەڵگای پێغەمبەری خودادا (درودو سڵاوی خوای لەسەر) عەهد و پەیمان نەماوە، خەڵك وەعد دەداو درۆیان دەکا، وەفا بـە عەهدەکـەی ناکات، بۆیە گوتم: قەیدی ناکات، با بکوژرێمـەوە، بـەڵام بـا کـەس قسەییێکی وەها لەسەر موسڵمانان نەکات!!

ئەمیری ئیمانداران زیـاتر دڵخۆشـبوو، بـە ئیمـان و بیرکردنـەوەی موسڵمانان، کە لە چ ئاسـتێکی ژیـاری بـەرزادن و بوونەتـە نمونـەی دڵخۆشی لەسەر پشتی زەوی، بەڵام دیسـانەوەش زۆری بـەزەیی بـەو پیاوکوژە هەژارەدا دەهاتەوە، کە تازە هیچ چار نییە، کات وردە وردە بەرەو خۆرئاوابوون دەچێ و دەبێ بەر لە بانگی مەغریب، قەصاصـی لێوەربگیرێت!! سەری بۆ پێشەخۆی شۆڕکردەوەو کەوتە دوعـا کـردن: .. خودایە گەیشتووینەتە کۆتایی کاتەکە، بە خۆت چارەسـەری ئـەو کێشەیە بکەی؟!

ئـەمیری ئیمانـداران لـەو بـارە دەروونییـەدا بـوو، دوو گەنجـەکان بانگیان کرد: ئەی ئەمیری ئیمانداران!!







ئەمیری ئیمانداران!! وشك بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: بێگومان دەڵێن: بۆ كات بە فیڕۆ دەدەی، فەرموو قەصاصەكەی لێ وەربگرەوەو ئیزنمان بدە، با بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان!!

بە هەر حاڵ!! ئەمیری ئیمانداران پێی گوتن: بەڵێ.

دوو گەنجەكان گوتیان: ئەی ئمیری ئیمانداران.. ئێمەش لەو پیاوە خۆش بووین!!

ئەمیری ئیمانداران و سەحابە بەڕێزەكان، كە ئامادەی مەجلیسەكە بوون و پیاوكوژەكەش خۆی، هەموویان یەكجار دڵخۆشبوون؟! زانییان خودای گەورە كە لە هەمووان بەبەزەییترە، دەرگای بەزەیی خۆی كردەوەو بە شێوەیێك كێشەكەی چارەسەر كرد، دڵی هەمووانی خۆش كرد!!

ئەمیری ئیمانداران پرسی: ئێوە لەبەرچی لەو پیاوە خۆش بوون؟!

دوو گەنجەكان گوتیان: لەبەر ئەوەی ئێمەش موسڵمانین.. ئێمەش ترسی ئەوەمان لێ نیشت، بڵێن: لە نێو كۆمەڵگای پێغەمبەری خوا (درودو سلاوی خوای لەسەر) لێكخۆشبوون و عەفوو نەماوە، بۆیە گوتمان: قەیدی ناكات، با خوێنی باوكمان بەفیڕۆ بڕوات، بەلام هیچ ناحەزێك هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخسێ، بڵێ: كۆمەڵگای موسڵمانان



وەهـای لێهـاتووە، کـەس کـەس عـەفو ناکات!!لەبـەر ئـەوەی لێـی خۆشبووین و هیچ سکاڵایەکیشمان لەسەر ئەو پیاوە نەما!!

ئەمیری ئیمانداران و سەحابە بەڕێزەکان (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ)، پیاوکوژە هەژارەکەو دوو گەنجەکەو هـەموو پێکـڕا، بـە فرمێسـك و خەندەی خۆشی، سوپاسی خودایان کرد، دەستی یەکتریان بـە تونـدی کوشی و بە دڵی خۆشـەوە هەڵسـانەوە خۆیـان بـۆ نوێـژی مـەغریب ئامادەکرد!!

بـەوەش ئـەو موسـڵمانانە سـەلماندییان ئیسـلام ئـاینی ژیانـەو خۆشەویستی، ئاینی چارەسەرییەو ئاینی سەرفرازی دونیاو دوایی!!

## موسڵمانان وەڵامی خراپە بە چاکە دەدەنەوە!

یەکێك هاتە لای ئیمام حەسەنی بەصرِی (ڕەحمەتی خوای لێ بـێ)، پێی گوت: فلاّنە کـەس غەیبـەتی تـۆ دەکـات و بـە خـراپ باسـت دەکات؟!

ئیمام پێی گوت: باشە بەیانی وەرەوە لام، شتێکت پـێ دەدەم بـۆی ببە!

کابرا گوتی: باشە.. ڕۆشت و بەیانی هاتـەوە لای، ئیمـام سـنیەك شیرینی پێ داو پێی گوت: برۆ ئەوە بۆ ئەو برایە ببـە، کـە غەیبـەتم











دەکات، پێی بڵێ: ئیمام سەلامی بۆت هەبوو، گوتی: ئەم شیرینییە لەبەر ئەوەیە، تۆ خێرەکانی خۆت لە دواماییدا بە من دەدەی، منیش ناچارم پاداشتت بدەمەوەو لە دونیادا ئەو شیرینییەت بۆ بنێرم!!

کابرای ناحەزی ئیمام، کە شیرینی و پەیامەکەی ئیمامی پێ گەیشت، پەشیمان بووەو بڕیاری دا، جارێکی تر خراپەی وەها نەکاتەوە!!

## موسڵمانان دەڵێن: دونیا شوێنی مانەوە نییە

دوای ئەوەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بووە هۆی شکستی ئیمپڕاتۆریەتی فارسی و گەورەترین سەرکەوتنی بەسەردا تۆمارکردن، کرایە والی کوفە، ماوەیەکی باش لەوێ بوو، خانووەکی نەبوو تیای بژی، چونکە ئەوەندە پارەی نەبوو توانای درووستکردنی خانوەکی هەبێ، بۆیە نامەیەکی بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نووسی و لە نامەکەیدا داوای ئەوەی لێکرد، ڕێگەی بدات بۆ پۆستی والی کوفە، لەسەر ئەرکی بەیتول مال خانووێك لە کوفە درووست بکات.

نامەکە گەیشتە خەلیفە، خوێندییەوەو بەو نامەیەی خوارەوە وەڵامی دایەوە:



**له ئەمیری ئیمانداران: عومەری کوڕی خەتاب**

**بۆ والی کوفە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس**

ئەسسەلام و عەلەیکوم وەڕەحمەتوللاهی وەبەڕەکاتوهو

له دواییدا:

نامەکەی تۆم پێگەیشت.. ڕازیم لەسەر داواکەت، بۆ ئەوەی لەسەر ئەرکی بەیتول مال خانوویێك بۆ پۆستی والی کوفە لە شاری کوفە دروست بکەن، بەڵام ئاگادار بە، خانوویێك دروست بکە، لە سەرمای زستان و لە گەرمای هاوین ڕزگارت بکات، بە پێچەوانەوە، نەکەی هەڵە بکەی، کۆشکێك دروست بکەیت، چونکە دونیا شوێنی مانەوە نییە.

وەسسەلام و عەلەیکوم وەڕەحمەتوللاهی وەبەڕەکاتوهو

## ئیسلام هی ژنان و پیاوانە

یەکێکە لە ژنە داوێن و دەروون پاکەکانی شاری مەککە، هەرکە بانگەوازی ئاینی ئیسلامی بیست و زانی محەمەدی ڕاستگۆو ئەمین بووەتە پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، یەکسەر ئیمانی هێناو موسڵمان بوو.











کاتێك بتپەرستانی قورەیش هەستیان بەوە کرد، خەڵکێك لە بتەکانیان هەڵگەڕاونەتەوە سەری بەرزیان بۆ بتەکان دانانەوێنن، جامی توڕەییان بەسەر ئەو خەڵکە موسڵمانە هەژارە ڕەش و ڕووتانەدا ڕشت بۆ ئەوەی هەڵیانبگەڕێننەوەو بیانگێڕنەوە سەر بتپەرستیەکەی جاران، لێرەدا سومەییە لە هەموو موسڵمانانی تر پشکی زیاتری لەو ئازار و خراپیانەی بتپەرستانی قورەیش بەرکەوت، بەڵام لەسەر بیروباوەڕی خۆی مایەوە، قوربانی بە هەموو شتێکی دا و لە ئیمان و ئاینەکەی خۆی هەڵنەگەڕایەوە. تا بەمە خوێنی پاکی بە ناهەق ڕژێنراو بووە یەکەم شەهیدی ئیسلام.

ئەم ژنە سەحابەییێکی بەڕێزی پێغەمبەری خوایە (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، خێزانی سەحابەییێکی بەڕێزە بە ناوی (یاسر)، کوڕەکەشیان سەحابەییێکی تری بەڕێزە بە ناوی (عەممار)، بۆیە بە (دایکی عەممار)یش دەناسرێت (ڕەزای خوا لە هەموویان بێت).

ئەم خاتونە مەولای ئەبی حوزەیفەی کوڕی موغەیرەی مەخزومی بوو، یاسریش هاوپەیمانی ئەبی حوزەیفە بوو، ئیدی ئەبی حوزەیفە سومەییەی دایە یاسر و بوونە ژن و مێردی یەك، دوای ئەوە خوای گەورە عەمماری پێبەخشین، ئەو کاتەش بانگەوازی ئیسلام لە مەککە سەریهەڵدا، سومەییە و عەممار زوو بوونە موسڵمان، دوای ئەوان یاسریش موسڵمان بوو، موجاهید دەڵێت: یەکەمینی ئەو کەسانەی







لە مەککە موسڵمانبوونی خۆیان دەرخست، حەوت کەس بوون، ئەوانیش بریتی بوون لە: ڕەسولوڵڵا (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، ئەبو بەکر، بیلال، خەبباب، صوهەیب، عەممار، سومەییە.

خەڵکی مەککە هەر یەکێکیان ئازار دەدا، کە موسڵمان دەبوو، ئەوەبوو ئالی بەنی موغەیرە کەوتنە ئازاردانی سومەییە، بۆ ئەوەی لە ئاینی خوا هەڵبگەڕێتەوە، بەڵام خەیاڵیان خاوبوو!! ئاخەر سوپاس بۆ خودای گەورە (سوبحانەهو وەتەعالا) ئیمان لە دڵی سومەییە جێگیر ببوو، ئیدی ئازار و چەوساندنەوە چ کاریگەرییەکی خراپی لەسەر دەبێت، بۆ هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام؟!

پێغەمبەری خودا (درودو سڵاوی خودای لەسەر) زۆر جار بە لای ئەو موسڵمانانەدا تێدەپەڕی، کە لە لایەن موشریکەکانەوە ئازار دەدران، ئامۆژگاری دەکردن، بە ئارام بن و صەبر بگرن، هەر کاتێکیش بە لای سومەییەو یاسری مێردی و عەمماری کوڕیاندا تێدەپەڕی پێی دەفەرموون: ئەی ئالی یاسر صەبر بگرن، مەوعیدی ئێوە بەهەشتە. ((صبرًا آلياسر، إن موعدكم الجنة)).. (الطبراني)

خۆ ئەگەر صەبرگرتنی موسڵمانە پیاوەکان لەو ستەم و ئازارەی موشریکەکان سەرسوڕهێنەر بێت، ئەوا سەبرگرتنی سومەییە بە ڕاستی سەرسوڕهێنەرترە، ئاخەر ئەو ژنێکی دەرچووی چ زانکۆ و پەیمانگایەکی خوێندنی باڵا نییە، ئەدی چۆن ئەو هەموو صەبرە









لەسەر ئیمانەکەی خۆی دەگرێ و لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی ئەبوجەهل دەیدات، هەر هەڵناگەڕێتەوەو وێردی پیرۆزی ئەزەلی و ئەبەدی ئەحەد ئەحەد دەڵێتەوە، بەوە شمشێری ئاگر دەخاتە دڵی ئەبوجەهل و کەللە ڕەقانی قوڕەیش، بۆیە ئەوانیش ناچار دەبن شمشێری ژەنگاوی ڕقی خۆیان، لە سەرگەردانی و زامی ئەو برینەی ئەحەد ئەحەدی سومەییە لە دڵی درووستکردوون، بخەنە زگی و شەهیدی بکەن.

ڕۆژێکیان ئەبو جەهل بەلایدا تێپەڕی، گوێی لێ بوو، هەندێ ڕستەو دەربڕین لە دەمی ئەو ژنەوە دەردەچن، هەموو ڕستەو دەربڕینی یەکتاپەرستینەو هی ئاینی ئیسلامن، جیانە لەو بەناو ئاینە بتپەرستیەی ئەبوجەهل و قەومەکەی لە ماوەیێکی درێژەوەیە لەسەرینە.. بەڵێ! ئەوەتا سومەییە دەڵێ: ئەحەد. ئەحەد. ئەڵڵاهو ئەکبەر. ئەڵڵاهو ئەکبەر.

ئەبوجەهل ئەمەی پێ قەبوڵ نەبوو، بێ ئەوەی هیچ مافێکی ئەو ژنە بپارێزێ، بێ ئەوەی تەنانەت ڕێز لە عورفی عەشایەریش بگرێ، کە لە عورفی عەشایەریدا پیاو لەگەڵ ژن شەڕ ناکات و دەستی بۆ نابات. ئەبوجەهل ئەوەشی لەبیر نەماو بە ڕقێکی پیسەوە لەو ژنە موسڵمانە نزیك بووەوە، پێی گوت: ئەوە تۆ چ دەڵێی ژن!! واز لەم قسانە بێنە، جوێن بە محەمەد بدەو کوفر بکە بە ئاینەکەی.



بەڵام سومەییە ئەمەی ڕەتکردەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەمە مەحاڵە، مەحاڵ!! محەمەدێك خودا لە سەرووی حەوت تەبەقی ئاسمانەوە پێی ڕازی بێ ببێتە نێرراوو پێغەمبەری خۆی بۆ بەندەکانی؟! منێکی بچووك لەسەر زەویدا چۆن پێی ڕازی نابم؟! محەمەدێك بووبێتە فریشتەی خێر و ئاشتی و چی باشی و جوانی و ئابڕوومەندییە ئەوە بڵاوبکاتەوە، من چۆن ئەو محەمەدە دەگۆڕمەوە بە ئەبوجەهلێك، کە هیچ لەم چاکی و جوانیانە نازانێ و لە وەتەی هەیە، خەریکی زوڵم و ستەمە!! محەمەد ژن وەکو پیاو دەزانێ و هەمان مافەکانی بۆ زامن دەکات؟! بەڵام ئەبو جەهل و دینەکەی، ژن بە کۆیلەو خزمەتکاری پیاو دەزانن، ئەگەر بیانەوێت وەکو ژن بۆ لەزەتە سێکسیەکان بەکاریان دێنن.. کە لێیان تێر بوون، سوکایەتییان پێدەکەن!! ئەگەریش پێویستیان بوو، ئەو ژنە وەکو مەڕ و وشتر دەفرۆشن و چ ڕێز و حورمەتێکی بۆ ناهێڵنەوە!!

سومەییە کە تەماشای دەکرد محەمەد و ئەبوجەهل دوو دونیای زۆر لەیەك جیان، لای محەمەد هەموو ڕێز و خۆشییەکی دونیاو دوامایی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی بە ژن و پیاو و ئاغاو گەدا و ڕەش و سپی زامن دەبێ!! بەڵام ئەوەی لای ئەبوجەهل و هاوڕێکانی پەیدا دەبن، بریتینە لە تەواوی ڕیسواییەکان و دونیایەکی تاریك و قێزەون،





دواماییەکی نادیار و پڕ مەشـەققەت، ژیـانێکی پـڕ کۆڵەمـەرگی و جیاوازی بێ مانا!!

سومەییە وەکو شێر لە شوێنی خۆیدا وەستاو بەوەی کـەوا بڕیـاری ئەبوجەهلی ڕەتکردەوە، داغێکی گەورەی بە دڵی ئەو پیاوەوە نا، کە پێی وانەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان ژنێکی لە ڕووانگەی خۆی و هاوڕێکـانی بێنرخ و قیمەت بە ڕوویدا بووەستێتەوەو پێی بڵێ: نەخێر. لەبەر ئەوە ئەبوجەهل بووە کوتلەیەك لە ڕق و قین و ڕمێکی لە ورگـی ئـەو ژنـە موسڵمانە خواناسە داو شەهیدی کرد.

تەنانەت ئەبوجەهل ئەوەشی نەکردە شەفاعەت بـۆ ئـەو خاتوونـە بەڕێزە، کە ژنێکی تەمەن گـەورەی بەساڵاچـووە، سـەری ڕەشـی بـۆ خزمەتی شارەکەی و نەتەوەکەی سـپی کـردووە، چـەندین پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی و هاوشـاری و نەتـەوەیی بـۆ دەیـان سـاڵە خۆیـان و بنەماڵەکانیان پێکدەبەستێتەوە!!

نا ئەبوجەهل ئەمانە هیچ نازانێ، ئەوەی بە قسـەی ئـەو نـەکات، مافی ژیانی نییەو نابێ بژی.. بۆیە بەم شـێوەیەی بەسـەر ئـەو ژنـە هەژارە بەساڵاچووە هێناو لە ماڵ و مندالەکانی دابڕی.

بەمە سومەییە بووە یەکەم شەهید لە مێژووی ئاینی ئیسلام، بـەر لە خۆی نەك هەر چ ژنێکی تر، بەڵکو چ پیاوێکیش قوربانی وەهایان بۆ ئیسلام و بیروباوەڕەکەیان نەدابوو.







بەڵێ سومەییە پیرو بەساڵاچوو و لاواز بوو لە ڕووی هێزی بازوو و لاشەوە، بەڵام بیروباوەڕی بەهێز بوو و خۆڕاگرێکی کەم وێنە بوو!! بووە هێمای خۆڕاگری و قوربانیدان! بووە ژنێك کە هەتا موسڵمانان مابن شانازی پێوە دەکەن و هەتا مێژوو مابێ بە ستەملێکراوو هێمای وەفا بۆ ئاین و بیروباوەڕو پێغەمبەرەکەی ناوی دەنووسێتەوە.

ئیبن و سەعد لە (تەبەقات)ەکەی خۆیدا دەڵێ: کە لە ڕۆژی (بەدر)دا (ئەبو جەهل) کوژرا، پێغەمبەر (درودو سلاوی خوای لە سەر) بە (عەممار)ی (کوڕی سومەییە)ی گوت: خودا بکوژی دایکتی کوشتەوە.

## خەلیفە مووچەی خۆی کەمدەکاتەوە

جارێکیان ئەمیری ئیمانداران و خەلیفەی دووەمی پێغەمبەری خوا (درودو سلاوی خوای لەسەر) عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ) دەچێتەوە ماڵ، دەبینێ خێزانەکەی بازنێکی زێڕی لە دەست کردووە، ئەویش سەیری پێدێ؟! ئاخەر خێزانی وی بازنی زێڕی لە کوێ بوو؟! بۆیە پرسیاری لێدەکات: ژنەکە ئەو بازنەت لە کوێ بوو؟! خێزانەکەی وەڵامی دەداتەوە: ئەوەم بە پاشەکەوتی ئەو پارەیە کڕیوە کە بۆ مەسروف پێمی دەدەی، هەر مانگەی شتەکم پاشەکەوت کردووە، تا بڕێ پارە کۆبووەتەوەو ئەو بازنەم پێکڕیوە.









خەلیفە پێی دەڵێت: ئادەی با بازنەکەت ببینم!

خێزانەکەشی بازنەکەی لە دەست دەکاتەوەو پێی دەدات.. خەلیفە دەڵێ: بازنێکی جوانە.. ئینجا پرسیاری لێدەکات: مانگانە چەندت پاشەکەوت دەکرد؟ خێزانەکەی دەڵێت: مانگانە ئەوەندەم پاشەکەوت کردووە؟

خەلیفە دەڵێت: دە باشە ئافرەت لەمەولا ئەوەندەی گوتت لە مووچەکەم دەبڕم، چونکە ئەوە پارەی موسڵمانانەو من زیادم وەرگرتووە! ئەو بازنەش دەبەمەوە بەیتولمال، چونکە خێزانی خەلیفەی بازنی ناوێ!

ژنەکەشی ڕازی دەبێت و شتێکی دیکە ناڵێت!! ئایا ئەگەر ژنە موسڵمانەکانی ئێستا بوونایە، ڕازی دەبوون!!

## باشترین مارەیی لای ژنی موسڵمان

ئەبو تەلحەی ئەنصاری ئەوکاتەی هێشتا ئیمانی نەهێنابوو، هاتە داخوازی ژنە صەحابییەی بەڕێز ئومو سولەیمی کچی مەلحان (ڕەزای خوایان لێ بێ).. ئومو سولەیم پێی گوت: وەڵڵاهی تۆ پیاوێکی لە ڕووی ئەسڵ و نەسەبەوە شیاوی!! پیاوی وەکو تۆ ڕەتناکرێتەوە!! بەڵام تۆ پیاوێکی کافری، منیش ژنێکی موسڵمانم!! ئایا نازانی ئەو







بتەی دەپەرستی دارێکە لە زەوی ڕوواوە، دارتاشێکی حەبەشی تاشیویەتی؟!

وەڵامی دایەوە: بەڵێ!! ئەوە دەزانم!!

ئوممو سولەیم پێی گوت: ئەدی حەیا ناکەی کارێکی وەها دەکەی؟! دەی ئەگەر بێت و موسڵمان ببی، لە موسڵمان بوونت بەولاوە، مارەییەکی دیکە داوا ناکەم!!

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتووە، دەڵێن: ئەبا تەڵحە پێی گوت: ئەی ڕومەیسا (ئەمە ناوی ئوممو سولەیم بووە).. ئەدی لە بارەی زەردو سپییەوە چی دەڵێی؟! (واتە: ئەدی چەندت زێڕ و زیو دەوێت)؟!

ئوممو سولەیم وەڵامیداوەتەوە: نە زەرد و نە سپیش!! هیچیانم ناوێن، لە بێجگەی ئیسلامبوونت هیچی دیکەم ناوێ و بە هیچ مارەییەکی دیکەش، لە بێجگەی ئەو مارەییە لە تۆ ڕازی نابم!!

ئەبا تەلحە پێی گوت: ئەوجا چۆن موسڵمان بم؟!

ئوموسولەیم پێی گوت: ئەوە پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر) لە فڵانە شوێنە، بچۆ خزمەتی و لە پێشیدا ئیمان بێنە!!

ئەبا تەلحە ڕازی بوو و بەرەو ئەو شوێنە چوو، کە پێغەمبەری خوای لێ بوو (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، کە پێغەمبەری خوای (درودو سڵاوی خوای لەسەر) چاوی پێکەوت، ئەوە ئەبا تەلحەیەو بەرەو لای









ئەو دەچێ، تێیگەیشت، بە هاوەڵە بەڕێزەکانی گوت: ئەوە ئەبا تەلحەیە نوری ئیسلام لە نێوچەوانیا بەدی دەکرێ!!

بەم شێوەیە ئەبا تەلحە موسڵمان بوو و ئوممو سولەیمی مارە بڕی!!

(سابت) کە یەك لە گێڕەرەوانی فەرموودەیە، گوتوویەتی: قەت مارەییەکی باشتر لەو مارەییەی ئوموسولەیم باشترمان نەبیستووە؟!

## ڕەوشتی موسڵمانانی ڕاستگۆ

سەهلی کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، ئامۆژگاری موسڵمانانی دەکردو پێی دەگوتن: ڕەوشتی موسڵمانی ڕاستگۆ وەهایە:

- نەك هەر بە درۆ، بەڵکو بە ڕاستیش سوێند بە (وەڵڵا) ناخۆن..

- نە غەیبەتی کەس دەکەن و نە ڕێگە دەدەن، کەسیش لە لای ئەوان غەیبەتی کەس بکات..

- بە زگی خۆیان قەت تێر ناخۆن..

- ئەگەر وەعدێکیان دا، بەجێی دەهێنن..









ـ کە قسەیان کرد، قەت بە گشتی قسە ناکەن و هەمیشە بـوواری ئەوە دێڵنەوە شتێك هەبێ، لە قسـەکەیان جیاببتـەوەو نەچێتە ژێـر وەسفە گشتییەکە..

هەروەها دەیگوت: براینە ئاگادار بن: ئەمڕۆکـە ڕۆژگارێکـە هـیچ کەسێك ناتوانێ ڕزگاربوونی خۆی لە دۆزەخ بەدەست بێنێ، تەنها بـە کوشتنی نەفسی خۆی و بە خۆبرسیکردن و ئارامگرتن و کۆششکردن نـەبێ!! ئەمـەش هـەمووی لەبـەر ئـەوەی خـەڵکی ئـەو ڕۆژگـارە کەوتوونەتە فەسادێکی گەورەوە!!

## زانای موسڵمان خەڵك بێئومێد ناکا

ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبی تالب (ڕەزای خوای لـێ بـێ) دەڵێت: فەقیە و زانای زۆر گەورە ئەو کەسەیە: کە هەرگیز خەڵکی لە ڕەحمی خودا بێئومێـد نـەکات.. هـەرگیز مـاوەی ئـەوەیان نـەدات، مەعصییەتی خودا بکەن.. هەرگیز دڵنیایان نەکات لە دۆزەخی خواو ـ نەڵێ ئێوە لە دۆزەخ ڕزگارەوە بوون ـ .. لەبەر ئارەزووکردنی هـیچ شـتێکی دیکـە، پشـت لـە قورئـانی پـیرۆز نـەکات و لێـی دوورنەکەوێتەوە.. چونکە خێـر لـە عیبادەتێـك نییـە، لـە سایەی زانستەوە نەبێ.. خێـر لـە زانسـتێکەوە نییـە، تێگەیشـتنی لەگـەڵ نەبێ.. خێر لە خوێندنەوەیەك نییە بە بیرو تەدەبورەوە نەبێ.










## ئامۆژگاریەکی حەسەنی بەصرِی



حەسەنی بەصرِی (رِەحمەتی خوای لێ بێ)، بە هەندێ لە قوتابیانی خۆی گوت: ئەی کورِانی ئازیزم.. ئەو کارتەم بخوێننەوە، کە ـ سێ خاڵانی تیایە و ـ هەر سێکیان لەبەر چاو بگرن، لە هەزار کتێبان باشترن:

١ـ ئەگەر لە شوێنێکی باش بوون، شانازی پێوە مەکەن، چوونکە هیچ شوێنێکی باش لە بەهەشت باشتر نییە، ئینجا باوکە ئادەممان تیایدا ئەوەی بەسەر هات، کە بەسەری هات!

٢ـ ئەگەر عیبادەتتان زۆر بوو، بە هۆیەوەی لە خۆتان بایی مەبن، چونکە ئەوەتا ئیبلیس ئەو هەموو عیبادەتەی هەبوو، کەچی کە بە هۆیەوەی لە خۆ بایی بوو، بینیتان چی بەسەر خۆی هێنا؟!

٣ـ ئەگەر بە لیقای پیاوچاکانەوە شاد بوون، لە خۆتان بایی مەبن، چونکە هیچ پیاوچاکێك ناگاتە پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، ئینجا کافر و مونافیقەکان هیچ سوودێکیان لێ وەرنەگرت!







## مەسیح داوا دەکات محەمەدی بین

لـە یـەك لـە مزگەوتـەکانی (نیـۆرك)دا لـە ناوچـەی (بـرۆکلین)، بەیانییەکیان دوای نوێـژی بـەیانی گـەنجێکی ئـەمریکی هاتـە نێـو مزگەوتەکەو بە موسڵمانەکانی گوت:

- دەمەوێت موسڵمان ببم..

پێیان گوت: تۆ کێی؟

گوتی: فێرم بکەن چۆن دەبمە موسڵمان و چیدیکەم لێمەپرسن.

گوتیان: دە بەخێربێی سەرچاو، وەرە بچۆ بەم شێوەیە خـۆت بشـۆ دوای ئەوە وەرەوە بـەم وشـانە شایەدومان بێنـە، ئیـدی تـۆ دەبیـە موسڵمان و دەبیـە برایـەکی ئـازیزی دینیمـان، بـە دڵ پیرۆزباییتـان لێدەکەین و بە دڵ بەخێرهاتننتان لێ دەکەین.

گەنجەکە چوو خۆی شۆردو هاتەوە لە پێش موسـڵمانەکاندا شـادەو ئیمانی هێناو بـووە برایـەکی نـوێی موسـڵمانەکان، ئینجـا دەرسـی نوێژیان پێگوت، بـە ماوەیـەکی کـەم فێـری بـوو و هـات نوێـژێکی یەکجار جوان و بە خشوعی کرد!!

ئەمە هەمووانی سەرسام کـرد؟! یـەکیان لێـی نزیکبـووەوە لێـی پرسی: برای خۆم.. تخوا پێم بڵێ چیرۆکی تۆ چییە؟!









گەنجەکە وەڵامیدایەوە: برام بە خوا من گەنجێکم لە زووەوە خەریکی مەسیحیەتم، دڵم زۆر پابەندی حەزرەتی عیسای مەسیح بوو (سەلامی خوای لەسەر)، تەماشام دەکرد، ئەو خەڵکە بە ناو مەسیحییە زۆر لە ڕەوشت و ئەخلاقیاتی مەسیح دوورکەوتوونەتەوە، ئەمە لەبەرچی؟ هەستم کرد، لەبەر ئەوەی کەموکوڕی کەوتۆتە نێو ئینجیل، کە ئەمە کتێبی ئاینەکەیە، ئیدی کە ئەمە وەکو خۆی نەماوە، دیارە خەڵکیش وەکو خۆی نامینێ، بۆیە کەوتمە خوێندنەوەی ئاینەکان و کە لە خوێندنەوە چوومە پێش، تەماشام کرد جیاوازی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت، قورئان و ئینجیل ئاسمان و ڕێسمانە، بۆیە زیاترم خوێندەوەو زیاترم بیرکردەوە، تا سەرەنجام لە ئیسلامدا زۆر نزیکبووبوومۆوەو لەسەر ئەوەبوو موسڵمانبوونی خۆم ڕابگەینم، لەو هەل و مەرجەدا ئەو بەیانییەی هاتمە لای ئێوە، شەوەکەی خەونم بینی، لە خەونەکەمدا عیسای مەسیح هاتە لام، بە پەنجەی شادەی وتەیەکی ئاراستە کردم و فەرمووی: تۆ ببە محەمەدی!!

ئیدی لە خەو هەڵسام، بینیم بەرەبەیانە، حەزم کرد کات بە فیڕۆ نەدەم و یەکسەر بێمە نێو موسڵمانان و موسڵمان ببم، ئەوەبوو ئەو مزگەوتەی ئێوەم دۆزیەوەو هاتمە لاتان موسڵمان بوونی خۆم ڕاگەیاند.

شەو بانگی عیشای دا، موسڵمانان نوێژیان دابەست، ئەو گەنجەش بە خشوع و تەقواکەی خۆی نوێژەکەی دابەستاو تەنیا یەك ڕکاتی



نوێژ کرد، لە ڕکاتی دووەمدا ئیمام هەڵسایەوە، نوێژکەران لە دوای ئیمام هەڵسانەوە، بەڵام ئەو نەیتوانی هەڵسێتەوە، بەڵکو سەری هەر لە سوجدەدا مایەوە، موسڵمانەکەی تەنیشتی بە دەستەکانی جوڵاندی، بۆ ئەوەی بزانێ بۆچی هەڵناسێتەوە؟! کە تەماشای کرد، لە سوجدەدا گیانی دەرچووەو خەندەیەکی خۆشی لەسەر لێوانییەتی.

ئەو گەنجە خوای گەورە پێی بەخشی، محەمەدی بردەوەو عیساشی نەدۆڕاند (سەلامی خوا لە محەمەد و لە مەسیح و لە تەواوی پێغەمبەرانی خوادا بێ).



## ناوەڕۆك


پێشەکی.............................٥
موسڵمانان لە خزمەتی یەکترین..................٧
موسڵمانان پەیمان پارێزن........................٧
ئەوەی باشترە، ئەو خواناسترە.....................٨
موسڵمانان پشت بە خوا دەبەستن...................٨
موسڵمانان شت بە ڕووەکەی تر دەبینن.................٩
موسڵمان نابێ بە پێش خوا بکەوێ....................١٠
موسڵمانان مافی هاوسێ بە گەورە دەزانن...............١١
موسڵمانان دەبێ ڕاستگۆ بن........................١١
نابێ جوێن بە گیانداریش بدەی......................١٢
موسڵمانان خاکین! ...............................١٣
موسڵمانان عاقڵن..................................١٦
موسڵمانان گوریسیان لە بنی دونیا ڕانەکێشاوە! ..............١٦
هیچ موسڵمانێك لە فرمانی خواو پێغەمبەرەکەی گەورەتر نییە.١٨
خەلیفە موسڵمانان خزمەتکاری هەمووانن..................٢١
والی موسڵمانان نابێ خراپترین والی بێ....................٢٢
خەلیفە خۆی بەیتولمال دەپارێزێ........................٢٣
لای موسڵمان هیچ شتێك لە خوا خۆشەویستتر نییە...........٢٤
خەلیفەی موسڵمانان مافی یەتیمان دەپارێزێ..................٢٥




خەلیفەی موسڵمانان دەست بۆ ماڵی میللەت نابەن.............٢٨

موسڵمانان بڕوایان بە خۆشی و ناخۆشی هەیە..................٢٩

ئادابی قسەکردن لە ئیسلام.........................................٣٦

ئامۆژگارییەکی بەسوود.................................................٣٧

موسڵمان گۆشتی براکەی ناخوات......................................٣٨

بەلای موسڵمانانەوە: ئەڵڵا لە هەموو گەورەیەک گەورەترە........٣٨

موسڵمانان لە بەهەشتی سۆز و وەفادا دەژین.....................٣٩

شێخ شامل و سزاکەی دایکی!!.........................................٤٠

موسڵمانان مافی خوایان بەلاوە گەورەترە.............................٤٣

موسڵمان مافی دایکیان بەلاوە گەورەیە..............................٤٣

موسڵمان دایکیان خۆشدەوێ...........................................٤٤

موسڵمانان دایکیان بەلاوە گرنگە......................................٤٥

ڕێزگرتن لە دایك و باوك..................................................٤٨

موسڵمان لە مردن بێ ئاگا نابێ.........................................٤٨

موسڵمانان غەمی ڕزقیان نییە..........................................٤٨

موسڵمانان هەقپارێزن....................................................٤٩

فرمانی خوا لەسەروی هەموانە...........................................٥١

موسڵمان هەمیشە براکانی وشیار دەکاتەوە...........................٥٢

موسڵمانان هەقی خۆیان وەردەگرن......................................٥٣

موسڵمان بەلای بۆ خۆی قەبولە، نەك بۆ کەسێکی تر..............٥٥










موسڵمانان بەسەبرن.......................... ٥٦
موسڵمانان چاکەی کەس لەبیر ناکەن.................. ٦١
موسڵمان دوامابییان بەلاوە لە دونیا نـزیکترە!............. ٦٢
موسڵمانان نەتەوەیەکی گەورەن........................ ٦٣
قازی موسڵمانان زۆر بلێ نابن........................ ٦٤
شاهێدی زاناو فەیلەسوفانی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام و موسڵمانان..... ٦٥
١ـ ڕۆجیێ دوبا سکویێ.............................. ٦٥
٢ـ لۆرد برینتۆن................................... ٦٦
٣ـ لۆرد ئیستانلی ئۆلدرلی........................... ٦٦
٤ـ مارگرێت مارکۆس................................ ٦٧
٥ـ عەلامەی دکتۆر عەبدولکەریم جەرمانۆس............... ٦٩
٦ـ ڕۆبەر ولزلیی هونەرمەند........................... ٧٠
٧ـ (دکتۆر گرینییێ)ی سیاسەتمەداری فرەنسی.............. ٧١
موسڵمان دەبێ لەسەر ڕێگەی ڕاست بێ.................. ٧٢
وتە و ئامۆژگاری زانایانی موسڵمانان.................... ٧٣
لە وتەکانی صەحابی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود............ ٧٨
لە وتەکانی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق................... ٧٨
موسڵمانان خۆیان خۆشتر ناوێ......................... ٧٩
موسڵمانان دووره نیفاقن.............................. ٧٩
ژنانی موسڵمان لە مێردەکانیان کەمتر نین................ ٧٩




ژنانی موسڵمانان نازان.......................... ٨١

موسڵمانان چاکەکار و بە عیززەتن.................. ٨٢

موسڵمان هاوسێی باشن........................... ٨٣

موسڵمان بەتەنیا خودای بەسە.................... ٨٣

موسڵمانان هەقخوازن............................ ٨٦

وتەی موسڵمانە ئاقڵەکان.......................... ٨٨

موسڵمانان لە پۆستەکان گەورەترن.................. ٨٩

موسڵمانان ڕوو لە خوا پشت لە دونیان................ ٩٠

موسڵمانان نەتەوەیەکی ژیارین..................... ٩١

خەلیفەی موسڵمانان لەخواترسە..................... ٩٢

موسڵمانان هەر نمونەن............................ ٩٢

موسڵمانان بە خواناسی دەبیەنەوە.................. ٩٣

خەلیفەی موسڵمانان هەژارانیان خۆش دەوێ.......... ٩٤

موسڵمانی باش لە ڕابردووشدا هەر باشە............. ٩٥

موسڵمانان گومانیان باشە......................... ٩٦

موسڵمانان هەرچی دەیکەن لە پێناوی خودایە......... ٩٧

موسڵمانان وەکو خۆیان بۆ یەکتر دەوێ.............. ٩٧

موسڵمانان ئەرك و مافی خۆیان دەزانن.............. ٩٩

موسڵمانان لە ژنەکانیان دەبوورن!.................. ١٠١

موسڵمانان زانستخوازن........................... ١٠٢











موسڵمانان زوو تورە نابن.......................١٠٣

لای موسڵمانان پاشاو خەلیفە بچووکترن لە زاناکان.........١٠٤

موسڵمانان خاوەنی چاکە گەورەکانن.....................١٠٥

موسڵمانان لە لوتکەی حەیا دان..........................١١٣

موسڵمان ئەخلاقیان بەلاوە گەورەترە......................١١٤

خێزانی پێغەمبەری موسڵمانان............................١١٦

موسڵمانان بشکەون، هەر خێری تیایە.....................١٢٠

موسڵمانان بە ویژدانن...................................١٢١

موسڵمان لەگەڵ خراپیش، هەر چاکە......................١٢٢

موسڵمان ئازار بۆ خۆی دەخوازێ نەك بۆ براکانی تری.........١٢٣

موسڵمان منالیشی هەر بە بەزەییە.........................١٢٤

موسڵمانان نمونەی برایەتین...............................١٢٦

موسڵمانان سوپاسی خودا دەکەن............................١٢٨

موسڵمان دڵنیایە لەوەی: هیچ شتێك بەبێئاگایی خودا نابێ....١٢٩

موسڵمانان شێر سیفەتن!.................................١٣١

موسڵمان زانستیان بەلاوە گرنگترە!........................١٣١

موسڵمانان لێبووردەن......................................١٣٢

موسڵمانان خێرو خۆشیی مرۆڤایەتییان دەوێ!................١٣٤

خەلیفەی موسڵمانان لە سکالای ژنێکی هەژار دەکۆڵێتەوە!......١٣٥

موسڵمان نابێ درۆ بکات...................................١٣٧




موسڵمانان بە ئەقڵەوە دەدوێن.................١٣٨
موسڵمانان شەرم لە خودا دەکەن...............١٣٩
موسڵمانان گەردنی یەك ئازاد دەکەن..............١٣٩
موسڵمانان خۆیان فێری دین دەکەن..............١٤٠
موسڵمانان گومانی باش بە یەکتری دەبەن.........١٤١
موسڵمانان ئازاری کەس نادەن....................١٤٢
موسڵمانان بڕوا بە هەموو شتێك ناکەن.............١٤٢
موسڵمانان ڕێزی مامۆستا دەزانن..................١٤٤
زانایانی موسڵمانان نمونەن........................١٤٥
باس و بەیانی پیاوی موسڵمان و چۆنیەتی دونیای بێ وەفا.....١٤٧
موسڵمانان خۆشییان بۆ هەمووان دەوێ.............١٥١
موسڵمان نابێ هەژاران لەبیر بکەن..................١٥٢
موسڵمانان دەستپێشخەر و بە متمانەن بەخۆیان!! ...........١٥٣
خەلیفەی موسڵمانان خاکین.......................١٥٤
موسڵمانان هەر بران..............................١٥٥
موسڵمانان زیرەك و وشیارن........................١٥٦
موسڵمانان زانستیان بۆ کارپێکردن دەوێ.............١٥٩
موسڵمانان پێغەمبەری خوایان بەلاوە زۆر گەورەیە..........١٦٠
موسڵمان لەگەڵ زاناو نەزانیش هەر دەژی..............١٦٢
موسڵمانان بە خودا پشت ئەستوورن...................١٦٢











خودا جێی متمانەی موسڵمانانە............ ١٦٣
موسڵمانان بۆ خوا ئیش دەکەن.................... ١٦٤
موسڵمانان خاوەنی عەهدو پەیمانن........... .......... ١٦٦
ئیسلام ئاینی ئازادییەو زۆرکردنی تیا نییـە............ ١٧٤
هیچ فاتحێك لە موسڵمانان بەڕەحمتر نەبووە!! ......... ١٧٥
خۆزگە موسڵمانان لە ئەوروپا بمابوونایەوە.............. ١٧٦
ئیسلام لە توانایدا جیهان فێری ژیان بکات............ ١٧٧
موسڵمانان هۆکاری ئارامی و پێکەوە ژیانن............ ١٧٨
موسڵمانان لە کاتی بەهێزیدا لێبووردەن.................. ١٧٨
ئیسلام ئازادی ئاینەکانی هێنا............................ ١٧٩
ئیسلام ئاینی هەموو گەل و نەتەوەکانە.................. ١٧٩
ئیسلام ئاینی ڕۆح و لاشەیە............................... ١٨٠
ئەوروپا بەرەو ئیسلامە..................................... ١٨٠
هەمووکەس عیشقی ئیسلامە!! .......................... ١٨٢
لە دادگای موسڵماناندا خەلیفەو هاووڵاتی یەکسانن........... ١٨٦
موسڵمان مردن بە دۆست دەزانن! ....................... ١٨٩
موسڵمانان بەرگریدەکەن و ستەم قەبوڵ ناکەن................ ١٩٠
چەند ئەزموونێکی موسڵمانان............................. ١٩٢
لای موسڵمان بە زۆر و کەمی نییە، بە بەرەکەتی خوایە........ ١٩٩
موسڵمانان بە دوو شت بێغەم دەبن......................... ٢٠٠




موسڵمانان دوعای چاك بۆ هەمووان دەکەن..................٢٠١

ئیسلام ئاینی ژیانەو خۆشەویستی!! ...................٢٠١

موسڵمانان وەڵامی خراپە بە چاکە دەدەنەوە! ...............٢١٤

موسڵمانان دەڵێن: دونیا شوێنی مانەوە نییە...................٢١٥

ئیسلام هی ژنان و پیاوانە...................................٢١٦

خەلیفە مووچەی خۆی کەمدەکاتەوە............................٢٢٢

باشترین مارەیی لای ژنی موسڵمان...........................٢٢٣

ڕەوشتی موسڵمانانی ڕاستگۆ..................................٢٢٥

زانای موسڵمان خەڵك بێئومێد ناکا............................٢٢٦

ئامۆژگاریەکی حەسەنی بەصری...............................٢٢٧

مەسیح داوا دەکات محەمەدی بین...............................٢٢٨

ئەم کتێبە گۆباس و بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەی نێو کۆمەڵگەی ئیسلامییە، ژیار و شارستانیەتی موسڵمانان و گەورەیی دین و پێغەمبەرەکەی پیشان دەدەن (درودو سڵاوی خوای لەسەر)، دەری دەخەن کە بەها ژیاری و حەزارییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەندە ئینسان بەرزدەکەنەوەو چۆن دەیبەنە پایەی بەرزی مرۆیی، دیسانەوە ئەوەش دەردەخات، کە: ئەگەر بێت و بە قورئان و فەرمودەو ژیاننامەی یەحابەکان (ڕەزای خوایان لەسەر) پەروەردە بن، ئەو پەروەردەیە و مەفاهیمەکانی ئەو دینە جوانەش لە سلوک و کردەوەکانمان ڕەنگبداتەوە، ئەوسا چەندە جوان و شیرین و گەورە دەبین.

ئەم کتێبە ڕۆژانی خۆش و پڕ ئارامی دەروونی و شادی کۆمەڵایەتی دەگێڕێتەوە، بەو هیوایەی هەمووومان لە ئاستی گەورەیی بەها حەزاری و ژیارییەکانی دینەکەی خۆمان بین و جوانترین نمونەی خواناسی و ئینساندۆستی پیشانی هەموو دونیا بدەین.

دەزگای چاپ و بەخشی نارین




هەولێر، بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
www.nareenpub.com
nareenpub@gmail.com
+9647504064610

نرخ: ٤٠٠٠ د.ع